زنجیرەی
ماڵێکی ئاسودە
3



# ڕازەکانی هەردوو هاوسەر بۆیەکتر

ئەنجامی ڕاپرسیەکی مەیدانی
کە لەنێوان (٥٦٠)کەسدا ئەنجامدراوە

نووسینی :
پارێزەر/صالح سعید مصطفی

2015

زنجیرەی ماڵێکی ئاسوودە

(٣)

# ڕازەکانی هەردوو هاوسەر بۆیەکتر

٢٠١٥

ئەنجامی ڕاپرسیەکی مەیدانی کە لەنێوان

(٥٦٠)کەسدا ئەنجامدراوە

ناوی کتێب: ڕازەکانی هەردوو هاوسەر بۆ یەکتر.

بوار: ڕاوێژکاری خێزانی.

نووسەر: پارێزەر/صالح سعید سۆرانی.

تایپ: خۆگر صالح.

چاپخانە: شڤان

تیراژ: ١٠٠٠

ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارە(١١٨٧) ی ساڵی ٢٠١٣ ی پێدراوە.

ساڵی چاپ: ٢٠١٥

نۆبەتی چاپ: دووەم.



Salihsorany@gmail.com

Salih.soray@facebook.com

پێشکەشە :

- بە گیانی پاکی باوکی خۆشەویست و ئازیزم.
- بە دایکی شیرینم خوا بیپارێزێت.
- بە هاوسەری خۆشەویستم.
- بە براو خوشکە شیرینەکانم.
- بە هەموو کەسێکی دڵسۆزو غەم خۆری ئاسودەیی خێزانەکان .
- بە هەموو ئەو هاوسەرە بەڕێزانەی کە دەیانەوێت گەشە بە مامەڵەی دروستی خێزانی بدەن .
- بەو هاوسەرە بەڕێزەی کە دەگەڕێت بە دوای رازەکانی دڵی هاوسەرەکەیدا .
- بەو خێزانە تازانەی کە پرۆسەی هاوسەرگیریان ئەنجام داوە.

## پێشەکی چاپی دووەم

خوشك و برایانی بەڕێزی خوێنەر، گرنگیدان بە خێزان وەکو یەکەی سەرەکی پێکهێنەری کۆمەلگە ، واتە گرنگیدان بە تەواوی کۆمەلگە، وە چارەسەری کێشە خێزانیەکان واتە پاراستنی تەندروستی تەواوی کۆمەلگە، بۆ گەیشتن بە هەموو جومگە گرنگەکانی خێزان پێویستە لە خودی هەردوو هاوسەر پرسیار بکەین، چونکە کاتێك نەخۆش سەردانی پزیشك دەکات، پزیشك بە پرسیار کردن لە خودی نەخۆشەکە دەگاتە دەرەنجام و چارەسەری بۆ دیاری دەکات، بە هەمان شێوە ئێمەش بۆ ئەوەی لە خێزانەکان دوور نەکەوینەوە بەڵکو چووینە ناو خودی خێزانەکان بە جیاوازی ئاستی ڕۆشنبیری و کۆمەلاَیەتی و زانستی و فکری و جوگرافی، و پرسیارمان لە خودی هاوسەرەکان کردووە تاکو بگەینە وەلاّمی ئەو پرسیار و داواکاریانەی لە ناخی هەردوو هاوسەردا هەیە بەرامبەر بەوی تر، لەم چاپەدا هەوڵمداوە  تیشکی زیاتر بخەمە سەر وەلاّمی پرسیارەکان پشت ڕاستیان بکەمەوە بە ڕای زانایانی دەروونناس و کۆمەڵناس، هەروەها زیادکردنی ڕاپرسی تر کە لە ولاّتانی تر ئەنجامدراوە، هەروەها بەراورد کردنی دەرەنجامی ڕاپرسیەکان لە گەڵ یەکتر،

ئەوەی لێرەدا گرنگە، ئەوەیە کە پێویستە هەردوو هاوسەر بەیەکەوە ئەم کتێبە بخوێننەوە تاکو بە هەردوولا بتوانن نەخشە ڕێگایەکی باشتر بۆ ژیانی داهاتووی خۆیان بکێشن بە شێوەیەك کەئاسوودەیی خێزانی زیاتر بۆ خۆیان و منداڵەکانیان فەراهەم بهێنن، چەند زیاتر هەوڵ بدەن گونجانی زیاتری هاوسەرێتی دروست بکەن ئەوەندە زیاتر ئاسوودەیی فەراهەم دەهێنن، هەروەها هاوکارێکی باش دەبێت بۆ پەروەردەکردنی منداڵەکانیان بە جوانترین شێوە. خۆشحاڵم کە لە ڕاو سەرنج و تێبینیەکانتان ئاگادارمان بکەنەوە تاکو بتوانین زیاتر ئەم بابەتە دەوڵەمەندتر بکەین، داواکارم خوای گەورەو بالاَ دەست بەختەوەرتان بکات، و لە هەموو ناخۆشی و نەخۆشیەکی جەستەیی و دەروونی و خێزانی بتانپارێزێت.

لە چاپی دووەمدا هەوڵمان داوە زیاتر لێدوان بکەین لەسەر خودی ئەو پرسیارەی کردوومانە ئەوەش بۆ زیاتر بەرچاوڕۆشنکردنی خوێنەری بەڕێز تاکو زیاتر لەسەر ئەو بابەتە بوەستێ و خۆی بخاتە بەردەم بەرپرسیارێتی، سەبارەت بە ١٤ پرسیارەکە کە بە بەڵێ و نەخێر وەڵام دراوەتەوە لە لایەن ژنان و پیاوانەوە وەڵامی هەردوو ڕەگەزمان بەیەکەوە

نووسیوە، وە لە بەشی یەکەمدا دامانناوە، بەڵام ئەوەی تایبەت بە پیاوانە واتە پرسیارەکەمان بە تایبەتی لە پیاوان کردووە تاکو ژنان بەرچاو ڕۆشن بن لە خوێندنەوەی ڕازی هاوسەرەکەیان، ، لە بەشی دووەمدا دامان ناوە، بەشی سێهەمیش تایبەت کراوە بە وەڵامی ژنان بۆ ئەوەی پیاوان خواست و داوای هاوسەرەکانیان لە زاری خۆیانەوە ببیستن، خوای گەورە پشت و پەنای هەمووان بێت و هەموو هاوسەرەکان بە ئاسوودەیی و خۆشەویستی و ڕۆمانسیەتەوە ژیان لە گەڵ یەك بگوزەرێنن.

**نووسەر**

٢٠١٢/١/١٤

## پــێشەكـــــی چاپی یەكەم

خێزان وەكو یەكەیەكی كۆمەڵایەتی ئەو دەزگاو ئۆرگانەیە كەدوو مرۆڤ لەدوو باری كۆمەڵایەتی جیاواز و دوو ژینگەی جیاوازەوە تیایدا بەیەكدەگەن، بەگرێبەستی هاوسەرێتی دەبنە هاورێ و هاوكارو هاوژین و هاوسەرین و هاوخەمی یەكتر تا لە ژیانداین .

كۆبوونەوەی ئەو دوو هاوسەرە لەبۆتەی ماڵێكدا وادەكات كە پەیوەندی لە هەموو بارێكی تر زیاتر پتەو و بەردەوام بێت بەو مەرجەی هەردووكلا بەرپرسانە مامەڵە لەگەڵ ئەو واقیعە تازە بكەن، بەحوكمی نزیكیی زۆرو بەردەوامی ومانەوەی زۆر لە چوارچێوەی بازنەی هاوسەرێتی، لێكخشان و بەریەككەوتنی زیاتریش دەبێت ...

ژن ومێرد بۆیەكتر وەكو پەڕاوێكی نەكراوە و نەخوێندراوەن، چەندین نهێنی و ڕاز و نیازی شاراوە لەهەریەكێكیاندا هەیە، لەبەرئەوە پێویستە باش و وردو لەسەرخۆ یەكتر بخوێننەوە .

لەهەر پەڕاوێكدا پێشەكیەك هەیە كە وەكو پێناسەیەكی كورت ودەروازەیەك وایە بۆچوونە ناو ناوەڕۆكی پەڕاوەكە .

هەموو مرۆڤێکیش پێشەکیەکی تایبەت بەخۆی هەیە، بۆکردنەوەی هەر دڵێکیش کلیلی تایبەت بەخۆی پێویستە، واتە بۆچوونە ناو ناخی هەرکەسێك پێویستە لەدەروازەی تایبەتەوە بچین نەك لەدیوارەوە خۆمان هەڵبدەینە ئەو دیوەوە، هەروەك قورئانی پیرۆز هانمان دەدات کە لەدەرگاکانەوە بچینە ناو ماڵەکان (وأتوا البیوت من ابوابها) ..

بێگومان هەرکەس خۆی باشتر دەتوانێت گوزارش لە حەزو داواو ڕازو نیازەکانی بکات، لەبەرئەوە زانایانی کۆمەڵناس ودەروونناس بناغەی زانستی کۆمەڵناسی و دەروونناسیان لە ئەنجامی چەندین لێکۆڵینەوە داناوە، کە لە سەر چەندین تاك وخێزان و کۆمەڵگە ئەنجامیانداوە، بۆئەو مەبەستە چەندین ڕاپرسی و گەشت و بڕینی هەزاران کیلۆمەترو چەندین ساڵ مانەوەیان ئەنجامداوە تاگەیشتوونەتە ئەو ئەنجامەی کە سەدان پەڕاوی نایاب و ناوازەیان لەچاپداوە کە خزمەتێکی باش بەکۆمەڵگەی مرۆڤایەتی دەکات ...

ئێمە دەتوانین سوود لەهەرنووسراوێك وەربگرین کە لەبواری کۆمەڵناسی و کاروباری خێزاندا نووسراوە، بەلاَم پێویستە ئەوە لەیاد نەکەین کە ئەو بابەتانە لەکۆمەڵگەیەك و واقیعێکی

کۆمەڵایەتی و خێزانی تایبەتدا نووسراوە، ناکرێت ئێمە بەتەواوی خۆمان تەسلیم بەهەموو ئەو بابەت ونووسراوو ئاراستانە بکەین .. بەڵکو لەگەڵ سوود وەرگرتن لەو بابەتانـــــە پێویستە خۆمان خاوەنی بابەت و لێکۆڵینەوەو توێژینەوەی تایبەت بەخۆمان و کۆمەڵگە و خێزانەکانی کوردەواری خۆمان بین، بۆ ئەوە مەبەستە لەمیانەی دابەزاندنی فۆرمێکی ڕاپرسیدا وەك دڵسۆزێك و زیاتر ئاشناکردنی هاوسەرەکان بەڕازونیازەکانی یەکتر، براتان ڕاپرسییەکم ئەنجامداوە بۆ ژمارەیەك لە خێزانە بەرێزەکان لەسەرتاسەری کوردستاندا کە (٣٦) پرسیاری لەخۆگرتووە، بەشداربووان ژن و پیاو بەپێی ئاستە جیاکانی کۆمەڵایەتی و پیشەیی و ئاستەکانی خوێندن بەشدارییان کردووە، ئەوەی لەبەردەستدایە تایبەتە بەراپرسیەکە کە (٢٥١ )ژن و (٣٠٩) پیاو بەشداری کردووە بەمشێوەیەی خوارەوە :

ژمارەی ژنە بەشداربووەکان بەپێی پیشە بەمشیوەیەبوو :

مامۆستا : ٨٠

فەرمانبەر : ٣٥

خوێندکار : ٢١

خانمی ماڵ : ١١٥

ژمارەی پیاوان بەپێی پیشە بەمشێوەیە بوو :

ئەندازیار :٢

پارێزەر :٤

مامۆستا : ١٤٣

پێشنوێژ: ١٤

فەرمانبەر : ٦١

تەندروستکار: ١٧

خوێندکار: ٨

کاسبکار : ٦٠

(٥) پرسیار پەیوەستە بە زانیاری کەسێتی وەکو( تەمەن و ناو و ڕەگەز و پیشە و ساڵەکانی هاوسەرگیری ) و(١٤) لە پرسیارەکان بە (بەڵێ) و (نەخێر)، وەڵام دەدرێنەوە (٧) پرسیارەکەی تر بەنووسین و لەشێوەی چەند خاڵێکدا.

پرسیارەکان هەمە لایەنە و زیاتر باس لەمامەڵەی ژن و پیاو دەکات لە چوارچێوەی حەرەمی خێزانیدا، لەکاتی دابەزاندنی فۆرمەکاندا ڕووبەڕووی گلەیی هەندێك براو خوشك بووینەوە،

گوایە ئەوە سنووربەزاندنە، پرسیاری بڤەی تیایە، ئەگەرچی ژمارەکە زۆر کەمبوو، بەلاّم هەرجێی نیگەرانیە، چونکە ئەوە نیشانەی ئەوەیە کەرۆشبنیری و خوێندنەوەی ژیاننامەی سەرداری مرۆڤایەتی (ﷺ) لەئاستی پێویستدا نیە جێی وەبیر هێنانەوەیە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) زۆر شەفافانە رۆشنبیری داوە بە هاوەلاّن لە چۆنێتی مامەڵەی ژن و مێرد لەگەڵ یەکتر لەهەموو بوارەکاندا بەتایبەتیش لە بواری زایەندیدا، یەکێك لەفۆرمەکان بەبێ وەلاّم بوو تەنها ئەوەندەی لێنووسرابوو ( بۆخۆتان ) یەکێکی تر لەسەری نووسرابوو بەکەڵکی وەلاّمدانەوە نایەت. هەندێك پرسیاریش لەهەندێك فۆرمدا وەلاّم نەدراونەتەوە هەر بەسپیەتی بەجێیان هێشتووە ، بەهەرحاڵ رێژەکەی زۆر کەمبوو بەلاّم بەپێویستم زانی کە ئاماژەی پێبکەم وەکو ئەمانەتێك .

نووسەر

هاوینی ٢٠٠٧

Salihsorany65@yamil.com

## ئەم ڕاپرسییە بۆ....؟

ڕاپرسی بەمشێوەیە شێوازێکی تازە و سەرکەوتووە بۆ گەیشتن بەڕاستییەکان، زانایان لە هەموو بوارەکاندا و بۆ گەیشتن بە هەر زانیاریەکی پێویست پشت بە توێژینەوە و ڕاپرسی مەیدانی دەبەستن، سەبارەت بەم ڕاپرسیەش گرنگیەکەی لەوەدایە کە خودی ژن و پیاو خۆیان وەلامی پرسیارەکانیان داوەتەوە، بێ هیچ زۆرلێکردنێك، بێگومان ئەم ڕاپرسیە سوودی زۆری هەیە، ئێمە ئاماژە بەهەندێکیان دەکەین لەوانە:

١- پرسیارە وەلآمنەدراوەکانی ناخی ژن وپیاو دەخاتە ڕوو کەلە دەروونیاندا پەنگی خواردۆتەوە .

٢- بوێریەك لای هەردوولا دروست دەکات تاکو بگەڕێن بەدوای چارەسەری کێشە خێزانیەکان .

٣- دیاری کردنی کێشەکان وەکو ئەوەی کە هەیە چونکە (التشخيص جزء من العلاج ) واتە دۆزینەوە و دیاریکردنی نەخۆشی بەشێکە لە چارەسەر. چونکە بۆ چارەسەری هەر کێشەیەك پێویستە زانیاری

کۆبکرێتەوە، دواتر شیکاری بۆ بکرێت ئنجا چارەسەر دەکرێت.

٤- دەرخستن و دیاریکردنی ڕازو نیازەکانی هەردوو ڕەگەز بۆیەکتر، چونکە هەرکەس خۆی باشتر دەناسێت و دەتوانێت تەعبیر لە ویست و داخوازیەکانی خۆی بدات.

٥- هەردوو ڕەگەز دەخاتە بەردەم بەرپرسیارێتی بەدەمەوە چوونی چارەسەری کێشەکان .

٦- وا لە هەردوولا دەکات باشتر یەکتر بخوێننەوە و بگەڕێن بەدوای هۆکارەکانی ئاسوودەکردنی یەکتردا.

## بەشی یەکەم
## وەڵامی (١٤) پرسیارەکە :

ڕێژەی وەڵامەکان جێی دڵخۆشییە چونکە ڕێژەیەکی باش لە پرسیارە ئیجابییەکان بە بەڵێ وەڵامیان داوەتەوە، وەڵامی پرسیارە سلبیەکان زۆربەی بە نەخێر وەڵامدراونەتەوە. هەڵبەتە پێویستە ئاماژە بە ڕاستیەك بکەین ئەویش ئەوەیە کە لە کۆمەڵگەی کوردەواری خۆماندا ڕاپرسی لە سەر ژیانی هاوسەرێتی کارێکی ئاسان نیە، نە بۆ توێژەر نە بۆ کەسانێك کە فۆرمی ڕاپرسیەکەیان پێ دەدرێت، لە لایەکەوە کەسی پرسیار لێکراو وا دەزوانێ ئەگەر وەڵامی پرسیارەکە بە سلبی بداتەوە ئیتر ئەوە لەسەر کەسایەتی خۆی و خێزانەکەی دەکەوێت، لەبەر ئەوە زۆرجار وەڵامەکان بە ڕاست و دروستی نادرێنەوە، ئەوەش وا دەکات کە توێژەر بە هنەڵەدا بچێت، کەواتە لە هەردوو بارەکەدا دەردەکە وەکو پێویست دیاری ناکرێت، تاکو چارەسەری گونجاوی بۆ دابنرێت، بەڵام بە شێوەیەکی گشتی ئەم وەڵامانە خزمەتی باش بە خێزانی کوردی دەکات، چونکە لە ناوجەرگەی خێزانەکانەوە هاتۆتە دەرەوە، با بەیەکەوە سەیرێکی وەڵامەکان بکەین:

## پرسیاری یەکەم : ئایا هاوسەرگیریەکەت بە ویستی خۆت بوو؟

پێش ئەوەی بچینە سەر وەڵامەکان پێویستە باسی ویست و ئیرادە بکەین، چونکە لە کۆمەڵگەی ئێمەدا تا ئێستاش هاوسەرگیری زۆرە ملێ هەیە و باوك و دایکەکان یان کەسوکار دەست دەخەنە کاروباری هاوسەرگیری، کە دەبوو لەم ڕۆژگارەی ئەمرۆدا ئەوە باوی نەمایە، نەك هەر لەم ڕۆژگارەدا بەڵکو دەبوو لە هەموو کاتێکدا لە کۆمەڵگەی ئێمە دووربوایە چونکە پێچەوانەی ئایینی پیرۆزی ئیسلامە، بێگومان هەموو گرێبەستێك پێویستی بەڕەزامەندی لایەنەکانی هەیە بۆ ئەوەی دابمەزرێت بەتایبەتی گرێبەستی هاوسەرێتی گرنگترینی گرێبەستەکانە کەبەردی بناغەی دامەزراندنی کۆمەڵگەیە، لەبەرئەوە پێویستە هەردوولا بەئیرادەیەکی ئازاد و ویست و خۆشەویستیەوە بەستنی ئەوگرێبەستەی قبوڵ بێت، ئەنجامی وەڵامەکانی ئەم پرسیارە زۆر جێی دڵخۆشییە. کەوەڵامەکانی ڕێژەی ٩٣٪ی بە بەڵێ یە .

ئایا هاوسەرگیریەکەت بەویستی خۆت بوو؟

وەڵامی ژنان بەم شێوەیە بوو:

بەڵێ: ٢٣٢     ٩٢,٤٣٪

نەخێر: ١٩     ٧,٥٦٪

سپی:-

| مامۆستا+ خوێندکار/١٠١ | | | فەرمانبەر/٣٥ | | خانەی‌مال/١١٥ | | | کۆی گشتی/٢٥١ | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| بەڵێ | نەخێر | سپی | بەڵێ | نەخێر | بەڵێ | نەخێر | سپی | بەڵێ | نەخێر | سپی |
| ٩٤ | ٧ | – | ٣٢ | ٣ | ١٠٦ | ٩ | _ | ٢٣٢ | ١٩ | – |

وەلامی برایانیش بەمشێوەبوو :

بەڵێ:٢٨٧     ٩٢,٨٪

نەخێر:٢٠     ٦٪

سپی:٢     ٠,٦٪

## پرسیاری دووەم : ئایا دڵخۆشیت بە ژیانی خێزانیت؟

ژیانی خێزانی پێوەرێکی سەرەکی خۆشبەختی و ئاسوودەیی مرۆڤە، چونکە ئەگەر مرۆڤ لەماڵەوە دڵخۆش وئاسوودەبوو ئەوا ئەگەر هەموو دنیا تاریکی و تووڕەیی بێت بەرامبەری دەتوانێت بەرگەی بگرێت، بەلاّم ئەگەر بەپێچەوانەوە بوو توانای بەرگەگرتنی بچووکترین کێشەی نیە و بەکەسانی تری دەڕێژێت، تەنانەت وەکوجەستەیەکی بێ گیان بەسەرزەویدا دەڕوات، لەبەرئەوە پێویستە گرنگی بەدڵخۆشیمان بدەین وکەش وهەوای بۆ بسازێنین، چونکە ماڵە ئارام و ئاسوودەکان تاکی باش و تەندروست پێشکەش بە کۆمەڵگە دەکەن، ڕێژەی وەلاّمی ئەم پرسیارەش جێی دڵخۆشیە و نیشانەی تۆکمەیی خێزانەکانی کۆمەڵگەی کوردی دەردەخات، ڕێژەی وەلاّم بە بەڵێ (٩٦،٥٪) ە، بۆ زیاتر زانیاری بەڕێزتان ئەم ڕاپرسیە لە ژینگەیەك و کۆمەڵە خێزانێکی پابەند بە ئیسلامەتی و دینداری ئەنجامدراوە لەبەر ئەوە ئاساییە کە دەرەنجامەکان بەم شێوەیە بێت چونکە پابەند بوون بە ڕێنمایی و ئاڕاستە دینداریەکان کاریگەری گەورە لەسەر مرۆڤ بەجێدەهێڵێت، ئەگەر سەرنجێکی داوا تۆمارکراوەکان لە

دادگاکانی باری کەسێتی بکەین لە کوردستان ڕێژەیەکی زۆر کەم لەو خێزانانەی تێدایە کە پابەندن بە دینداریەوە، پێویستە لێرەدا ئەوەش ڕاست بکەینەوە کە جیاوازی بکرێ لە نێوان عیبادەتی بە عادەت و عیبادەتێك بە تێگەیشتن و وەرگرتن بە ڕۆشنبیریەوە.

**ئایا دڵخۆشیت بە ژیانی خێزانیت؟**

| مامۆستا+ خوێنکار/١٠١ | | | فەرمانبەر/٣٥ | | خانەی‌ماڵ/١١٥ | | | کۆی گشتی/٢٥١ | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| بەڵێ | نەخێر | سپی | بەڵێ | نەخێر | بەڵێ | نەخێر | سپی | بەڵێ | نەخێر | سپی |
| ٩٥ | ٦ | - | ٣٤ | ١ | ١١١ | ٤ | _ | ٢٤٠ | ١١ | - |

وەڵامی برایانیش بەمشێوەبوو :

بەڵێ: ٢٩٢ ٩٤,٤٩٪

نەخێر: ١٢ ٣,٨٨٪

سپی: ٥ ١,٦٪

## پرسیاری سێیەم: ئایا هاوسەرت خۆشەویستیت بۆ دەردەبڕێت؟

خۆشەویستی هەوێنی ژیانە، ژیان بێ ئەو تاریکستانە، دڵێك بێ خۆشەیستی وێرانەیە و جێی باوەڕی بە باشی تیا نابێتەوە خۆشەویستی ترۆپکی داواکارییەکانی ژیانە. بەختەوەرە ئەو کەسەی تێی بگاتو دەستی بخات. بەدبەختە ئەو کەسەی تێی ناگات و لێیبێ بەشە. خۆشەویستی گەورەترین نهێنی ژیانە. خۆشەویستی بزوێنەری سەرەکی ژیانە. ئەگەر نەبوو ژیانیش نیە. ئەگەر هەبوو ژیانیش بوونی هەیە. ئەگەر ئاو نهێنی بوونی بونەوەرەکان بێت، ئەوا خۆشەویستی نهێنی بوونی گیانەکانە. لەگەڵ ئەوەدا کە، خۆشەویستی جوانترین ماناکانی پەیوەندی یە هۆی سەرەکی ژیانە. زۆرێك لە ژنان تێیناگەن و بێ بەشن لێی. هەروەها زۆرێك لە پیاوانیش تێی ناگەن و لێی بێ بەشن، لێرەوە یەکەم شتێك کە دەستی پێ بکەین باس کردنی مانای خۆشەویستی و پێناسەکردن و شیکردنەوەیەتی.

خۆشەویستی دوو جۆری سەرەکییە:خۆشەویستی ڕەها و خۆشەویستی مەرجدار، خۆشەویستی ڕەها (بێ مەرج)؛

خۆشویستنی کەسانی بەرامبەرە بێ کۆتو مەرج. تۆ خۆشت دەوێن لەکاتێکدا ئەوان وەکو ئەوە نین کەتۆ دەتەوێت.

بەلام خۆشەویستی مەرجدار: ئەو خۆشەویستیەیە، کە لەناواخنیدا (ئەگەر)ی لەخۆگرتووە.....(تۆم خۆش دەوێت ئەگەر مستیلەم بۆ بکڕیت)، (تۆم خۆش دەوێت هەرکات ئەوەی من لێت داوا دەکەم ئەنجامی بدەیت)، (ئەگەر تۆ ڕەفتارت جوان بکەیت خۆشم دەوێیت)، خۆشەویستی مەرجدار هەر لەسەرەتای منداڵییەوە لەدایك و باوکمانەوە بێ ئاگایانە وەرمان گرتووە. ئەمجۆرەی خۆشەویستی کەسانێکی ئازاردەرو ئازارچێژ بەرهەمدێنێت.

قورئانی پیرۆز ئامـاژەی ڕۆشنی تیایە سەبارەت بەو خۆشەویستیەی پێویستە لە نێوان ژن و مێردا هەیە، کاتێك خوای گەورە دەفەرموێت: ومن آياته ان خلق لكم من انفسكم ازواجا لتسكنوا اليها و جعل بينكم مودة و رحمة، إن في ذلك لآيات لقوم يتفكرون)

واتە: وە لە ئایەتەکانی خوا ئەوەیە کە لە خۆتان هاوسەری بۆ دروست کردون بۆ ئەوەی لە پاڵ یەکتردا ئارام بن، وە لە

نێوانتاندا خۆشەویستی و ڕەحمەت و میهرەبانی داناوە، لەوەشـدا یەلگە و وانە هەیە بۆ کەسانێ و نەتەوەیەك کە بیر بکاتەوە.

چونکەسەروەری مرۆڤایەتی(ﷺ)دەفەرموێت :

(واللە لاتدخلوا الجنة حتی تؤمنوا ولن تؤمنوا حتی تحابوا..الخ) واتە سوێند بەخوا ناچنە بەهەشتەوە هەتاباوەڕنەهێنن، باوەڕیشتان تەواو نابێت هەتا یەکترتان خۆش نەوێت ...هتد هەندێك لەزانایان دەڵێن ئەگەر خۆشەویستی هەبێت یاسا پێویست ناکات چونکە تاوان لەنەبوونی خۆشەویستی وبوونی ڕق وکینە لە شوێنیدا ئەنجام دەدرێت ، وەئەو خۆشەویستیە پێویستە لەنێوان هەموومرۆڤەکاندا بەگشتی وهاوسەرەکان بەتایبەتی هەبێت وە پێویستە دەریببڕن بۆیەکتر هەروەکو پێشەوای مرۆڤایەتی (ﷺ)دەفەرموێت: ئەگەر یەکێکت خۆشویست هەواڵی بدەرێ کە خۆشتدوێت، کەواتە دەربڕینی خۆشەویستی بۆ هاوسەرەکەت پەرستشە و پاداشتی خوایی دەست دەخەیت جگە لەوەی کەهاوسەرەکەت زیاتر بۆ لای خۆت کەمەندکێش دەکەیت، پێویستە هەردوولاتان واتە ژن وپیاو ئەو خۆشەویستییە بۆیەکتر دەربڕن، بێگومان وەلآمی ئەو دوو

پرسیارەی سەبارەت بەخۆشەویستی نێوان ژن و پیاو وەدەربڕینی هەریەك بۆئەویتریان دڵخۆشکەرە، بەڵام پێویستە زیاتری بکەین.

**ئایا هاوسەرت خۆشەویستیت بۆ دەردەبڕێت؟**

| ماموستا+ خوێنکار/١٠١ | | | فەرمانبەر/٣٥ | | خانەی‌ماڵ/١١٥ | | | کۆی گشتی/٢٥١ | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| بەڵێ | نەخێر | سپی | بەڵێ | نەخێر | بەڵێ | نەخێر | سپی | بەڵێ | نەخێر | سپی |
| ٩١ | ١٠ | - | ٢٥ | ١٠ | ١٠٥ | ١٠ | _ | ٢٢١ | ٣٠ | - |

وەڵامی برایانیش بەمشێوەبوو :

بەڵێ: ٢٨٣ ٩١,٥٨٪

نەخێر: ٢٤ ٧,٧٦٪

سپی: ٢ ٠,٦٪

## پرسیاری چوارەم: ئایا تۆ خۆشەویستی بۆهاوسەرت دەردەبڕیت؟

بێگومان دەربڕینی خۆشەویستی تۆ بۆ هاوسەرەکەت بریتیە لە هەوێنی بەردەوامی ژیان و ڕۆمانسیەت، ئەگەر لە بەرامبەر دەربڕینی خۆشەویستی هاوسەرەکەت تۆ هیچ جم و جوڵ و وەلأمێکی ئیجابی جوانت نەبوو، ئەوا دەبیتە هۆی لە گۆڕنانی هیواو چاوەڕوانی هاوسەرەکەت کە تۆ هەروەکو پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: هاوسەرەکەت مافی بەسەرتەوە هەیە، خوشك و برای بەڕێزم ئەگەر کەسێك یەك چاییت بۆ بکرێت زۆر بۆی مەمنوونیت، بەلأم هاوسەری ژیانت خۆی بەتەواوی پێشکەش بە تۆ کردووە، هەموو کەسوکاری بۆ تۆ جێ هێشتووە، ئیتر کاتی ئەوە نەهاتووە کە تۆش بیرێك لە بەرامبەرەکەت بکەیتەوە، دەربڕینی خۆشەویستی بۆ هەردوو هاوسەر هەم مافە و هەم ئەرکە، پێویستە تۆ وەکو ئەرکی سەرشانی خۆت خۆشەویستی بۆ هاوسەرەکەت دەرببڕیت، دواجار ئەویش خۆشەویستی بۆ تۆ دەردەبڕێت، وتراوە: (أدِ ما عليك يؤتيك ما لك) واتە ئەوەی ئرك لە سەر شانت، ئەومت دەست دەکەوێت کە مافی خۆتە، جگە لەوەش پێویستە تۆ چاوەڕێی شتێك نەکەیت بەرامبەر بە

ئەرکێك کە ئەنجامی ئەدەیت، چونکە ئەمە دوکانداری نیە هەروەکو دکتۆر محمد عەمارە وتویەتی، ئێوە هاوسەری یەکترن پەیوەندیەکەتان زۆر پیرۆزە خوای گەورە بە( میثاقاً غلیظاً) ناوی بردووە واتە پەیماننامەی پتەو و بەهێز دەرەنجامی ڕاپرسیەکە بەم شێوەیەی خوارەو بوو:

| مامۆستا+ خوێنکار/١٠١ | | | فەرمانبەر/٣٥ | | خانەی‌ماڵ/١١٥ | | | کۆی گشتی/٢٥١ | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| بەڵێ | نەخێر | سپی | بەڵێ | نەخێر | بەڵێ | نەخێر | سپی | بەڵێ | نەخێر | سپی |
| ٩٠ | ٩ | ٢ | ٣٠ | ٥ | ١١٢ | ٣ | _ | ٢٣٢ | ١٧ | ٢ |

وەڵامی برایانیش بەمشێوەبوو :

بەڵێ:٢٩١ ٪٩٤,١٧

نەخێر: ١٦ ٪٥,١٧

سپی: ٢ ٪٠,٦

## پرسیاری پێنجەم :ئایا ژووری نووستنتان جیایە لەمندالّ و میوان؟

ژووری نووستن گرنگی زۆری هەیە لەژیانی هەموو کەسدا بەگشتی و ژن ومێرد بەتایبەتی، خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا و لە سورەتی پیرۆزی ( النور)دا دەفەرمویت: یا أیهاالذین آمنوا لیستأذِنکم الذین ملکت ایمانکم والذین لم یبلغوا الحُلمَ منکم ثلاث مراتٍ، من قبل صلاة الفجر وحین تضعون ثیابکم من الظهیرة و من بعدِ صلاة العشاء، ثلاث عوراتٍ لکم.......الخ).النور/٥٨.

واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە بە خوایەتی خوا و پێغەمبەرایەتی محمد(ﷺ)و هەموو ئەرکانەکانی ئیمان، با مۆڵەتتان لێوەربگرن ئەوانەی کە بەردەستتانن و ئەوانەش کە نەگەیشتوونەتە تەمەنی پێ گەیشتن سێ جار، لە پێش نوێژی بەیانی و دوای نیوەڕۆ کاتی خۆکردنەوە، و دوای نوێژی خەوتنان، سێ کات کە بە عەورە و داوێن دادەنرێت بۆ ئێوە، ئەمەش بۆ ئەوەیە کە ژن و پیاو کاتی گونجاویان هەبێت بۆ بەیەکەوە دانیشتن و ڕاز گۆڕینەوە لە گەڵ یەکتر و وەرگرتنی چێژی زیاتر لە یەکتر، کەواتە پێویستە کاتی تایبەت و شوێنی

تایبەت بۆ بەیەکەوە بوون دیاری بکرێت دوور لە چاوی خەڵك و تەنانەت میوان و منداڵ و خزم و کەسان، دیاری کردنی کات و شوێنی تایبەت بە هەردوو هاوسەر گرنگی زۆري هەیە بە تایبەتی لە ڕۆژگارێکی وەك ئەمڕۆدا کە هۆکاری لە یەکترکردنی هاوسەران و سەرقاڵکردنیان زۆرە، باری ژیانێکی گران و سەرقاڵ بوونی پیاوان بە کارو کاسبی و دەوامی فەرمانگە و بوونی تەلەفزیۆن و هۆکارەکانی تر کاتێکی وای نەهێشتۆتەوە کە ژن و مێرد کاتی تەواو بە یەکەوە گفت و گۆ و ڕاوێژ بە یەکەوە بکەن و ڕازەکان لە گەڵ یەکتر بگۆڕنەوە، جێگە جیاکردنەوە لە منداڵ و میوان یەکێکە لە هۆکارەکانی بەردەوامی خۆشەویستی و ئاسوودەیی خێزانی، بەڵام ئەوەی تێبینی دەکرێت لە ڕاپرسیەکەدا نزیکەی ٥٠٪ زیاتر نیانە بێگومان ئەوە کاریگەری خراپ لەسەر ژیانی خێزانی بەجێدەهێڵێت ، چونکە مرۆڤی سروشتی سێ یەکی تەمەنی لە ژووری نووستندا بەسەر دەبات کەلە (٢٤) کاتژمێری شەووڕۆژدا (٨)ی بەخەو بەسەردەبات واتە ئەگەر کەسێك (٩٠) ساڵ ژیان بەرێتە سەر ئەوا (٣٠)ساڵی لە ژووری نووستندا بەسەسەربردووە ، تێکەڵ خەوتن جگە لەوەی کاریگەری خراپ لەسەر پەروەردە کردنی منداڵ بەجێدەهێڵێت ،

بەو رادەیە زیاتر ئازادی هەردوو هاوسەر زەوت دەکات و دەبێتە مایەی درستکردنی کێشەی تری خێزانی کە هۆکارەکەی دەگەرێتەوە بۆنەبوونی ژووری نووستن ، پێغەمبەری سەروەرمان (ﷺ) هانماندەدات کە لە تەمەنی (١٠)ساڵیەوە جێگە بۆ منداڵ جیابکەینەوە ، لەبەرئەوە پێویستە ئەگەر بەدانانی پەردەش بووە جێگەی نووستن جیابکەینەوە .. وەبۆئەوەی بتوانیت زیاتر رێز لەمیوانەکت بگریت وە ئەویش ئاسوودەتر بکەیت خۆی بە موزاحیم نەزانێت ئەوا پێویستە ئەو بەجیا بخەوێت و تۆش لەلای هاوسەری خۆت بەمجۆرە مامەڵەکردنە پەروەردەیەکی دروستی منداڵەکانت دەکەیت بۆ دوا رۆژ ..

لەگەڵ ئەو گرنکیەدا وەلآمەکان جێی سەرنجە کە بەمجۆرەیە:

بەڵێ: ٤٧,٥٪

نەخێر: ٥١,٣٪

سپی :١٪

بێگومان ئەو دەرئەنجامە جێی هەڵوێستە کردنە !! سەیری نەخشەکە بکەن لەو دیوی پەڕەکە .......

**ئایا ژووری نووستنتان جیایە لەمنداڵ و میوان؟**

| مامۆستا+ خوێنکار/١٠١ | | | فەرمانبەر/٣٥ | | خانەیماڵ/١١٥ | | | کۆی گشتی/٢٥١ | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| بەڵێ | نەخێر | سپی | بەڵێ | نەخێر | بەڵێ | نەخێر | سپی | بەڵێ | نەخێر | سپی |
| ٩٤ | ٧ | - | ٣٢ | ٣ | ١٠٦ | ٩ | _ | ٢٣٢ | ١٩ | - |

وەڵامی برایانیش بەمشێوەبوو :

بەڵێ: ١٦٥ ٥٣,١٣٪

نەخێر: ١٤٢ ٤٥,٩٥٪

سپی: ٢ ٠,٦٪.

## پرسیاری شەشەم : ئایا خۆت بۆ هاوسەرت دەڕازێنیتەوە دەکەیت ؟

خۆجوانکردن وگرنگیدان بەجل وبەرگ و خۆڕازاندنەوە و بەکارهێنانی بۆنی خۆش و ڕاگرتنی دڵی هاوسەرت یەکێکە لەو هەنگاوە سەرەکیانەی ژیانی خێزانیت کە پێویستە بینێیت، تاکو لەبینینت چێژوەربگرێت. پێغەمبەری سەردارمان محمد(ﷺ) زۆر گرنگی بە جوانی و پاکوخاوێنی داوە وە هێمای کردووە بۆ ڕاستیەك کە لە دنیادا سێ شت لای خۆشەویست کراوە، یەکەمیان بریتیە لە( الگیب) واتە: بۆنخۆشی و هەندام ڕێکی، هەمیشە بۆنخۆش بووە، بە تەواوی مانا دڵی هاوسەرەکانی ڕاگرتووە بە بۆنی خۆش و پاکوخاوێنی، هەرگیز مرۆڤ حەزی ناچێتە سەر شتێکی ناشیرین و بۆن ناخۆش، بێ گومان هەندێك کەس خوای گەورە بەهرەی جوانیەکی تا ڕادەیك باشی پێ بەخشیون، بەڵام لەگەڵ بوونی جوانی زۆریشدا ئەگەر گرنگیدان بە پاکوخاوێنی نەدات ئەوا جونیەکەی ون دەبێت، کەواتە خوشك و برای بەڕێزم زۆر پێویستە گرنگی بە پاکو خاوێنی بۆنخۆشی خۆت بدەیت بە ڕادەیەك کە دڵی هاوسەرەکەت بۆ لای خۆت کەمەند کێش بکەیت. خوشکان بە تایبەت زۆر پێویستە پارێزگاری لە ناسکی و جەمالیەتی خۆیان بکەن و هەوڵی ئەوە بدەن بە جوانیەکەیان چاوی هاوسەریان بۆ خۆیان یەکلایی بکەنەوە، بە تایبەتی تریش لەم ڕۆژگارەی ئەمڕۆدا کە پیاوان لە جەنگێکی قورسدان لە گەڵ دەروون و ناخی خۆیاندا، کە لە بازاڕ و شوێنە

گشتیەکاندا ئافرەتان بە جوانترین شێوە دەبینن، و بۆنیس زۆر هەستیاریان لە خۆیانداوە، کە کاریگەری گەورە لە سەر پیاوان جێدەهێڵێت، ئەگەر بەمحاڵەوە خوشکان وەکو پێویست گرنگی بە جوانی و خۆ ڕازاندنەوە نەدەن ئەوا هاوسەرەکەیان دڵی بە لای ئافرەتی تردا دەڕوات، بە شێك لەو ڕۆیشنە هۆکارەکەی و بەرپرسیارێتیەکەی دەکەوێتە ئەستۆی خاتوونە بەڕێزەکان.

جێی داخە کە زۆرێك لە خانمان ئەوەندەی گرنگی بە خۆجدوانکردن دەدەن بۆ دەرەوە بە نیو ئەوەندە گرنگی بە جوانی خۆیان نادەن لە ماڵەوە لە کاتێکدا کە خۆ جوانکردن بۆ دەرەوە بەو شێوەیە کە ببێتە هۆی سەرنج ڕاکێشانی پیاوانی تر جۆرێکە گوناهباری و تێکدانی باری خێزانەکان.

ئیبن عەبباس (خ،ر)دەفەرموێت:

(انا اتزین لزوجتی کما هی تتزین لی ) واتە: من خۆم بۆهاوسەرم دەرازێنمەوە هەروەکو ئەو خۆی بۆ من دەڕازێنێتەوە ،کاتێك خوای گەورە باسی پۆشاکبوونی هەردوو هاوسەر دەکات بۆیەکتری لای بەڕێزتان ڕۆشنە کەچ پۆشاکێك لەبەرکردنی خۆشە، کەواتەپێویستە گرنگی زۆر بەم خاڵە بریێت لەژیانی خێزانیدا، لە وەڵامی پرسیاری سەبارەت بەم خاڵە دا ٨١،٧٪ بەبەڵێ وەڵامیان داوەتەوە بەڵام لە١٧٪ دەڵێ نەخێرهەروەك لەخشتەکەدا دیارە:

## ئایا خۆت بۆ هاوسەرت دەڕازێنیتەوە دەکەیت ؟

| مامۆستا+ خوێنکار/١٠١ | | | فەرمانبەر/٣٥ | | خانەی‌ماڵ/١١٥ | | | کۆی گشتی/٢٥١ | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| بەڵێ | نەخێر | سپی | بەڵێ | نەخێر | بەڵێ | نەخێر | سپی | بەڵێ | نەخێر |
| ٩٤ | ٧ | - | ٣٢ | ٣ | ١٠٦ | ٩ | _ | ٢٣٢ | ١٩ |

وەڵامی برایانیش بەمشێوەبوو :

بەڵێ: ٢٤٦ ٧٩,٩٦٪

نەخێر: ٥٩ ١٩٪

سپی:٤ ١٪

## پرسیاری حەوتەم : ئایا دەستپێشخەری لە ئاشتکردنەوەدا؟

نزیکترین دووکەس لەژیانی مرۆڤایەتیدا بۆیەکتر ژن ومێردە، بێگومان بەوڕادەیەش بەریەککەوتن ولێکخشانی زیاتر دروست دەبێت، لەبەرئەوە شتێکی سروشتییە ئەگەر نیگەرانی لەنێوانیاندا دروست ببێت بەحوکمی ئەوەی کە مرۆڤن، مرۆڤیش بێبەش نیە لەهەڵە کردن هەروەکو پێغەمبەری پێشەوامان محمد (ﷺ) دەفەرموێت: کل بني آدم خطاءٌ، وخیر الخطائین التوابون)، واتە هەموو مرۆڤەکان هەڵەکارن، وە باشترینی هەڵەکاران ئەوانەن کە تەوبە دەکەن و پەشیمان دەبنەوە لە هەڵەکانیان، بێ گومان هەموان ئەوە دەزانین کە ئەگەر مافێك پەیوەندی بە خوای گەورەوە هەیە بە تەوبەکردنێکی ڕاستەقینە کۆتایی پێ دێت، بەلاّم ئەوەی پەیوەندی بە مافی مرۆڤەکانەوە هەیە پێویستە بگەڕێنرێتەوە بۆ خاوەنەکانی، ئەگەر ئەو کەسەش بریتی بێت لە هاوسەرەکەت ئەوا پێویستە زیاتر ئەو مافە بگەڕێنیتەوە، پۆزش هێنانەوە زۆر قورس نیە، بەلاّم جۆرێك لە ئازایەتی دەخوازێت. بەلاّم ئەوەی لێرەدا گرنگە

ئەوەیە هەردوولاوەکو یەك گیان وابن بەلأم لەدوو جەستەدا پێویستە لەوکاتانەدا هەریەك لەلای خۆیەوە پێشبڕکێ بکات بەڵکو ئەو زووتر ئەویتر ئاشت بکاتەوە و خێرە گەورەکە بۆخۆی بپچڕێت، لە ژیانی خێزانیدا پەیوەندی ئینسانی و ئیسلامی و هاوسەرێتی، هەرکام لەو سێ جۆر پەیوەندی ئەوە دەخوازێت کە هەردوو هاوسەر پێشبڕکێ بکەن لە ئاشتکردنەوەی بەرامبەرەکەیان کە بریتیە لە هاودەم و هاوخەم و هاوشادی و خۆشی دنیا و دوا ڕۆژ. لە نێوان هەردوو مرۆڤێکدا ناکرێ ڕق و کینە و خۆ بەزلزانی هەبێتن چونکە هیچ کەس لەوی تر گەورەتر نیە ، مەگەر کەسەیان کە باشترە بۆ ئەوی تریان، کەواتە گەورەیی مرۆڤەکان بە ڕادەی باش بوون و سوودبەخشیەتی بۆ بەرامبەرەکانی، ئەو کەسەی شاتەوایی دەکاتە کالأی بالأی پێش هەموو کەس خزمەتی گەورە بە ناخ و ناوەرۆکی خۆی دەکات، خۆی ئاسوودە دەکات و بەرامبەرەکەی دڵخۆش دەکات و خوای گەورە لە خۆی ڕازی دەکات.

وەلأمی ئەم پرسیارەی خوارەوە بەمجۆرەیە کە لە٧٤٪ ی بەشداربووان بە بەڵێ وەلأمیان داوەتەوە بەلأم لە٢٦٪ بە نەخێر ئەم دەرنجامە ئەگەرچی باشە بەلأم وریایی دەوێت :

**ئایا دەستپێشخەری لە ئاشتکردنەوەدا؟**

**وەڵامەکە لەم خشتەیەی خوارەوەدا ببینە کە دەرەنجامەکان دەردەخات:**

| مامۆستا+ خوێنکار/١٠١ | | | فەرمانبەر/٣٥ | | خانەیمال/١١٥ | | | کۆی گشتی/٢٥١ | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| بەڵێ | نەخێر | سپی | بەڵێ | نەخێر | بەڵێ | نەخێر | سپی | بەڵێ | نەخێر | سپی |
| ٩٤ | ٧ | - | ٣٢ | ٣ | ١٠٦ | ٩ | _ | ٢٣٢ | ١٩ | - |

**وەڵامی برایانیش بەمشێوەبوو :**

**بەڵێ:** ٢٤٥ ٪٧٩,٢٨

**نەخێر:**٦٠ ١٩,٤١

**سپی:** ٤ ٪١

## پرسیاری هەشتەم: ئایا کەسوکاری هاوسەرت دەستدەخەنە کاروباری خێزانیتان ؟

حەرەمی خێزانی تایبەتە بەدوو هاوسەر سێهەمێکی تیانیە وەحورمەتی خۆی هەیە بۆیە پێویستە هیچ کەس ئەو حەرەمە نەبەزێنێت ،کاتێك خوای گەورە باسی پەیوەندی پڕخۆشەویستی و سەکینەی نێوان ژن ومێرد دەکات تەنانەت منداڵیشی تیانیە، ماف دان بەهەرکەس لەدایك و باوك و خوشك و برا و کەسانی تر نابێت لەسەر حسابیماڵەوە بێت، ئەوەی گرنگە بۆ هاوسەران ئەوەیە کە دەبێ بزانن چۆن مامەڵە لە گەڵ کەسوکاریاندا دەکەن، نابێ کارێکی وا بکەن کە کەسوکاریان ببن بە بەشێك لە کێشەی ناوخۆیی، بەڵکو تەنها بە پێی پێویست سوودیان لێ وەربگرن بۆ چارەسەری کێشە، چونکە زۆر خێزان لە بەریەك هەڵدەوشێنەوە بە هۆی دەستێوەردانی کەسوکاری یەکیچك لە دوو هاوسەر یان کەسوکاری هەردووکیان، واتە پێویستە هەردوو هاوسەر پارێزگاری لە سەربەخۆیی ڕاو سەرنجی خۆیان بکەن، تا بۆیان بکرێ خۆیان چارەسەری کێشەکانی خۆیان بکەن و نەهێڵن کێشەکەیان بگاتە کەسی سێهەم، ئەوەش بەوە دەبێت کە کاتی تایبەت بە یەکتر ببەخشن

بۆ گویٚ گرتن له یەکتر، به تایبەتی پیاوان پێویسته ئەو ڕاستیه بزانن که ژن هەمیشه بەدوای کەسێکدا دەگەڕێت که کێشەکانی لا باس بکات چونکه ژنان ناتوانن ماوەیەکی زۆر دان بەخۆیاندا بگرن و قسه له کێشەکانیان نەکەن، لێرەوه پێویسته پیاوان خۆیان ئەو کەسه بن که گویٚ له هاوسەرەکەیان بگرن، و کاتی تایبەتیان بدەنیٚ، لەبەرئەوه پێویسته کەسوکاری هەردوولا خۆیان بەدووربگرن له دەستێوەردانی ژیانی خێزانی کچ وکوڕەکەیان، مەگەر لەحاڵەتێکی زۆر پێویستدا ئەویش لەسەرداوای خۆیان یان کاتێك هەست بکرێت ستەمێك یان ناحاڵیبوون هەیه ئەش بابۆ دەستگرتن بێت نەك شێواندن، له دەرەنجامی به دواداچوونێکمدا بۆ دیاردەی جیابوونەوه و زۆر بوونی و هۆکارەکان ئەو زۆربوونه له دادگاکانی ناو شاری سلێمانی ، له وەڵامی زۆرێك له پارێزەره بەڕێزکاندا ئاماژەیان بۆ چەند هۆکارێك کرد، دەست تێوەردانی کەسوکار یەکێك بوو له هۆکاره سەرەکیەکانی زۆربوونی جیابوونەوه له ناو خێزانەکاندا، بێگومان ئەگەر ئەم ڕاپرسیەمان له نێوان ئەو خێزانانەدا ئەنجام بدایه وەڵامەکان به پێچەوانەوه دەبوو، بەڵام وەڵامەکان که له

نێوان ئەو خێزانانەدا ئەنجامدراوە رێژەی وەڵامەکان بەمجۆرەیە ، بەڵێ بۆپرسیاری ئەم بوارە لە (١٩٪ )ە  ونەخێر لە(٧٩٪)ە..

**ئایا کەسوکاری هاوسەرت دەستدەخەنە کاروباری خێزانیتان ؟**

| ماموستا+ خوێنکار/١٠١ | | | فەرمانبەر/٣٥ | | خانەی‌ماڵ/١١٥ | | | کۆی گشتی/٢٥١ | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| بەڵێ | نەخێر | سپی | بەڵێ | نەخێر | بەڵێ | نەخێر | سپی | بەڵێ | نەخێر | سپی |
| ٤٠ | ٦ | ١ | ٣٢ | ٣ | ٢٢ | ٩١ | ٢ | ٧٢ | ١٧٦ | ٣ |

وەڵامی برایانیش بەمشێوەبوو :

بەڵێ:٣٤ ١١٪

نەخێر:٢٧٤ ٨٨,٦٧٪

سپی: ١ ٠,٣٪

## پرسیاری نۆیەم : ئایا کێشەی دەرەوە کاریگەری هەیە لە سەر ژیانی خێزانیتان؟

کێشەی دەرەوەی خێزان بەهیچ شێوەیەك دروست نیە بگوازرێتەوە بۆ ناو ماڵ هەرجۆرێکە، چارەسەرکردنی کێشەی کەسانی تر کارێکی زۆر گەورەیە بەلاّم بەمەرجێك هیچ کاریگەریەکی خراپ لە سەر پەیوەندی خێزانی بەجێ نەهێڵێت، بەتایبەتی ئەگەر کێشەیەك کەوتە نێوان یەکێك لەهاوسەرەکان و کەسوکاری هاوسەرەکی تر بەڵکو پێویستە زۆرداناییانە چارەسەر بکرێت و نەهێڵن کاریگەری خراپ لەسەر پەیوەندی نێوان ژن ومێردەکە بەجێبهێڵێت، لە بەرنامەیەکی ڕادیۆییدا بەڕێزێك پەیوەندیەکی تەلەفۆنی بە بەرنامەکەوە کرد و هاوار و ناڕازیبوونی خۆی دەربڕی بەرامبەر بە هاوسەرەکەی کە بۆ ماوەی زیاتر لە ١٥ ڕۆژ دەنگی لێ دابڕیوە و قسەو قسەڵۆکی ناشیرین و نابەجێ بە موسوڵمانان دەدات بە هۆی ئەوەی کە دوای مردنی برایەکی و شووکردنەوەی براژنەکەی بە موسوڵمانێکی مولتەزیم، ئەمەش بۆتە کێشەیەکی خێزانی و مردنی براکە بۆتە مۆتەکەیەك بەسەر ژیانی ئەو خێزانەوە، کە ئەمە بە ڕاستی جێی تێڕامانە.

حەرەمی خێزانی حەرەمێکی پیرۆز و سەربەخۆیە نابێ بە هیچ جۆرێك ڕێگە بدرێت کێشەیەك کە هیچ پەیوەندیەکی پێیەوە نیە بهێنرێتە ناوی، پێویستە هەردوو هاوسەر ئەوە لەبەر چاو بگرن کە دواجار خەڵکانی تر و بەتایبەتیش کەسوکار هەریەکە و دەچێتەوەناو ژیانی تایبەتیێ خێزانی خۆی، ئیتر بۆچی ئەم خێزانە گرفت بۆخۆیان دروست بکەن، ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە لە کاتی پێویست و بە پێی توانا هەڵنەستیت بە چارەسەرکردنی کێشەی کەسانی تر، بەڵکو مەبەستمان ئەوەیە کە کێشەی خەڵکی تر نەخزێنرێتە ناو خێزان، و نەکرێتە هۆی لێکترازانی خێزانەکە، هەندێك کات و هەندێك خێزان قسەیەکی زۆر سادە و کێشەیەکی سادە و ساناى کەسانی تر دەکەن کێشەیەکی گەورە بۆ خیزانەکەی خۆیان و خۆیان دەردەدار دەکەن بە دەردێك کە دەکرا خۆیانی لێ بەدوور بگرن، کورد گوتەنی سەری نایەشێ و دەیپێچێ، بە داخەوە لەم ڕاپرسیەدا ڕێژەیەکی زۆر ئاماژە بە کاریگەری کێشەی دەرەوە دەکەن لەسەر ژیانی خێزانیان، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە خێزانەکانمان زۆر پارێزراو نیە، لە دەردو ئافاتە دەرەکیەکان.

ڕێژەی وەلآمی ئەم پرسیارەی خوارەوە بەمجۆرەیە :

بەڵێ: ٦٠ ڕێژەی ٢٣,٩ ٪ .

نەخێر: ١٨٥ڕێژەی ٧٣,٧ ٪ .

سپی: ٦ ڕێژەی ٢,٠٪ .

**ئایا کێشەی دەرەوە کاریگەری هەیە لەسەر ژیانی خێزانیتان ؟**

| ماموستا+ خوێنکار/١٠١ | | | فەرمانبەر/٣٥ | | خانەی‌ماڵ/١١٥ | | | کۆی گشتی/٢٥١ | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| بەڵێ | نەخێر | سپی | بەڵێ | نەخێر | بەڵێ | نەخێر | سپی | بەڵێ | نەخێر | سپی |
| ٢٥ | ٧٢ | ٤ | ٥ | ٢٠ | ٢٠ | ٨٣ | ٢ | ٦٠ | ١٨٥ | ٦ |

وەڵامی برایانیش بەمشێوەبوو :

بەڵێ: ١٢٩ ٪٤١,٧٤

نەخێر: ١٧٥ ٪٥٦,٦٣

سپی: ٥ ٪١,٦

## پرسیاری دەیەم : ئایا لە بواری سێکسیدا لە هاوسەرت ڕازیت؟

لایەنی زایەندی (جنسی ) لەژیانی مرۆڤدا پانتاییەکی گەورەی داگیرکردووە ، کە ئێمە وەکو پێویست قسەی لەسەر نەکەین ئەوا کەسانێکی نەشیاو باسی لێوەدەکەن و خراپ بەکاری دێنن، لەژیانی خێزانیشدا پێویستە وەکو خۆی مامەڵەی لەگەڵ بکرێت خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا زۆر بەگرنگ باسی لێوە کردووە ، تەنانەت ڕۆشنبیریمان دەداتێ کە دەفەرموێت:

(احل لكم ليلةالصيام الرفث الى نسائكم هن لباس لكم وانتم لباس لهن ) .

(نسائكم حرث لكم فأتوا حرثكم انى شئتم وقدموا لأنفسكم ).

(ولاتباشروهن وانتم عاكفون في المساجد) (وكيف تأخذونه وقدافضى بعضكم الى بعض وأخذن منكم ميثاقا غليظا) .

ئەو ئایەتانەی سەرەوە هەموویان باس لە پەیوەندی (جنسی) ژن ومێرد دەکات، ئایەتی یەکەم تایبەتە بە شەوانی مانگی پیرۆزی ڕەمەزان، کە ئەم مانگە بە مانگی قورئان و عیبادەت و تەسبیحات و زیکرو یادی خوا ناو دەبرێت بەڵام خوای گەورە ئەو لایەنەی فەرامۆش نە کردووە، بەڵکو ڕێنمایی موسوڵمانان دەکات و پێیان دەفەرموێت: کە

شەوانی ڕۆژووگرتنتان چوونە لای خێزانەکانتان حەڵاڵە بۆتان، ئەوان پۆشاکن بۆ ئێوە، ئێوەش پۆشاکن بۆ ئەوان، واتە پێویستە وەکو پۆشاك و جەستە بچنە ناو یەك و ئاوێزانی یەکتر بن، بۆ زیاتر گرنگیدان بەولایەنە پێشەوای مرۆڤایەتی محمد (ﷺ) لەچەندین فەرموودەدا ڕۆشنبیری سێکسی بە هاوەڵە بەڕێزەکان داوە، لەوانە: ئامۆژگاری پیاوان دەکات کە بە وریاییەوە و هەست کردن بە هاوسەرەکانیان بچنە لای هاوسەرەکانیان هەر بۆیە ئاماژەی بەوە کردووە کە نەکەن وەکو ئاژەڵ خۆتان فڕێبدەنەسەر هاوسەرەکانتان، وە باسی نەفرەتی فریشتەکان دەکات کاتێك یەکێك لەژن ومێرد داوای سەرجێیی لەویتر کرد بەڵام ئەو ئیستیجابەی نەبوو، لەبەرئەوە پێویستە هەردوو لاگرنگی پێبدەن و دڵی یەکتر ڕابگرن، چونکە یەکێك لە هۆکارەکانی بەردەوامی و ئاسوودەیی خێزانی و زیادکرنی خۆشەویستیە لە نێوان هەردوو هاوسەر، زانایانی کۆمەڵناس زۆر گرنگیان بەم بوارە داوە، ڕاستیەکە ئەوەیە کە بەشێك لەو حەزەی کە خوای گەورە لە لای هەردوو ڕەگەز بەرامبەر یەکتر دروستی کردووە بریتیە لە حەزی زایەندی و چێژ لە یەکتر وەرگرتن

بەڵام لە چوارچێوەی خێزاندا و بە پێی گرێبەستێك لە سەر سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ)، وە بە پێی ئەو مەرجانەی کە شەریعەت دیاری کردووە. وەڵامەکانی ئەم بوارەش بەم جۆرەیە:

**ئایا لەبواری سێکسیدا لە هاوسەرت رازیت؟**

| ماموٚستا+ خوێنکار/١٠١ | | | فەرمانبەر/٣٥ | | خانەیماڵ/١١٥ | | | کۆی گشتی/٢٥١ | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| بەڵێ | نەخێر | سپی | بەڵێ | نەخێر | بەڵێ | نەخێر | سپی | بەڵێ | نەخێر | سپی |
| ٩٤ | ٧ | - | ٣٢ | ٣ | ١٠٦ | ٩ | _ | ٢٣٢ | ١٩ | - |

وەڵامی برایانیش بەمشێوەبوو :

بەڵێ: ٢٣٣ ٪٧٥,٤٠

نەخێر: ٥٦ ٪١٨,١٢

سپی: ٢٠ ٪٦,٤٧

## پرسیاری پانزەیەم : ئایاهیچ نووسراوێکت دەربارەی ڕۆشنبیری سێکسی خوێندۆتەوە یان بۆت باسکراوە ؟

سەرەتا پێویستە ئاماژە بەوە بکەین کە خوێندنەوە لە ژیانی تاك و خێزان و کۆمەڵگەدا کاریگەری گەورەی هەیە لە ئاسوودە کردن و سەرکەوتندا، وە ڕۆشنبیری جۆراو جۆر بۆ ژیان زۆر پێویستە، بە تایبەتی ژیانی خێزانی زۆر پێویستی بە خۆ ڕۆشنبیرکردن هەیە بۆ بەردەوامی ژیان و تێپەڕاندنی ئەو گرێ و گۆڵ و بەربەستانەی دێنە سەر ڕێ ژیان، ئەگەر سەیرێکی ڕێژەی جیابوونەوەکان بدەین لە دادگاکانی باری کگەسێتی کوردستان کە تەنها لە ساڵی ٢٠١٢ دا زیاتر لە ٥٠٠٠ داوای جیابوونەوە یەکلایی بۆتەوە بە جیابوونەوەی هاوسەرەکان لە یەکتر، بەلاّم ڕێژەیەکی کەمی هاوسەرە ڕۆشنبیرەکان لە ئاستێکی بالاّدای تیایە کە ئەمە ئاماژەیە بۆ گرنگی ڕۆشنبیری لە ژیانی خێزانیدا.

زانایانی دەروونناس ئاماژە بە پێویستی بوونی سێ جۆر(انسجام) دەکەن بۆ ئاسوودەیی خێزانی کە بریتیە لە ئینسجامی دەروونی و کۆمەلاّیەتی و سێکسیە، ڕۆشنبیری سێکسی کاریگەری گەورەی

هەیە لە سەر ئینسجامی سێکسی کە ئەویش ئاسوودەیی خێزانی دەپارێزێت.

ڕۆشنبیری سێکسی کاریگەری گەورەی هەیە لە چەسپاندنی خۆشەویستی لە نێوان ژن و مێردەکان، بە جۆرێك دەبێتە هۆی بەردەوام بوون و چێژ وەرگرتنی زیاتر لە یەکتر، زۆرێك لە پیاوان و ژنانیش ئاماژە بەوە دەکەن کە لە ژیانی هاوسەرێتیاندا زۆر کەم چێژ لە هاوسەرەکانیان وەردەگرن، چونکە ئەتەکێتی مامەڵەی هاوسەرێتی بەگشتی و سێکسی بە تایبەتی بوونی نەبووە لە ژیانیاندا، لەبەرئەوە پێویستە ژن و پیاو لە بواری ئەتەکێتی ژیان و بوارەکانی هاوسەرێتی زۆر بخوێننەوە تاکو کەسێکی نەرم و ئاسان و خۆش مامەڵە بێت بۆ هاوسەرەکەی کە ئەمەش وادەکات ژن و مێرد زیاتر لە یەکتر نزیك دەکاتەوە.

خۆڕۆشنبیر کردن لەهەموو بوارێکدا لەسەرمرۆڤ پێویستە بەتایبەتی لە بواری (جنسی) دا کەپانتاییەکی بەرچاو لەژیانی ژن و مێردا گرتووە چونکە هاوسەرەکەت کەجیهانێکی ناسکی هەیە پێویستە زۆر ناسکانە مامەڵەی لەگەڵدا بکەیت ئەوەتە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمێت:(رفقا بالقوارير) ئەم لێکچواندنە بە شووشە ئەوە دەگەیەنێت کەدەست بۆبردنی لەسەرخۆیی و

نەرمونیانی دەوێت، وەلآمی بەشداربوان بۆ ئەم پرسیارە بەمجۆرەیە :

بەڵێ:٦٠٪ ، نەخێر:٢٦٪ سپی:١٣٪

ئایاهیچ نووسراوێکت دەربارەی رۆشنبیری سێکسی خوێندۆتەوە یان بۆت باسکراوە ؟

| ماموستا+ خوێنکار/١٠١ | | | فەرمانبەر/٣٥ | | خانەیمال/١١٥ | | | کۆی گشتی/٢٥١ | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| بەڵێ | نەخێر | سپی | بەڵێ | نەخێر | بەڵێ | نەخێر | سپی | بەڵێ | نەخێر | سپی |
| ٩٤ | ٧ | - | ٣٢ | ٣ | ١٠٦ | ٩ | _ | ٢٣٢ | ١٩ | - |

وەلآمی برایانیش بەمشێوەبوو :

بەڵێ: ٢٢٦ ٧٣,١٤٪

نەخێر: ٦٥ ٢١٪

سپی: ١٨ ٥,٨٢٪

## پرسیاری دوانزەیەم: ئایا لەبۆنەکاندا دیاری پێشکەش بەهاوسەرت دەکەیت؟

گەڕان بەدوای زیاتر کردنی خۆشەویستی لەنێوان ژن ومێردا هەنگاوێکی زۆر پیرۆزە، بەخشینی دیاریش یەکێکە لەو هۆکارانەی کە دەبێتە هۆی زیادکردنی خۆشەویستی، لە ڕووی دەروونیەوە کاریگەری گەورە لەسەر کەسی دیاری پێبەخشراو بەجێ دەهێڵێت، دەستەواژەیەك لە ناو خەڵکدا زۆر دووبارە دەبێتەوە کە وتراوە ( الانسان عبد الاحسان) واتە: مرۆڤـ دەبێتە کۆیلەی چاکەکردن لەگەڵیدا، بێگومان لە بەرامبەر هەمو بەخشینێکدا وەرگرتنێك هەیە، پێغەمبەریش(ﷺ)هانمان دەدات کە دیاری پێشکەش بەیەکتر بکەین: (تهادوا تحابوا). چونکە بە بەخشینی دیاری خۆشەویستی بەردەوام دەبێت و ڕق و کینە بار دەکات.

شاعیریش جوانی وتوە:

| | |
|---|---|
| وإن الهدية مبهرة | كالسحر يجتنب القلوب |
| تدني البغيض من الهوى | حتى تصيره قريبا |
| وتعيد معتضد العداوة | بعد نفرته قريبا |

دیاری بەخشین بە هاوسەری ژیانت چەندین پەیامی پێ ئاراستە دەکەیت لەوانە:

١. پەیامی تازەکردنەوەی خۆشەویستی: هاوسەری ژیان دڵنیا دەکاتەوە لە بەردەوامی خۆشەویستی، ساڵەکان هەر چەند درێژ بووبنەوە.

٢. پەیامی سوپاسگوزاری: ئەو کەسەی سوپاسی خەڵکی نەکات سوپاسی خوای گەورەش ناکات، جێی سەرسامیە هاوسەرێك ئەو هەموو ماندووبوون و سەرقاڵیەی هەبێت لە پێناو خزمەت کردن و ئاسوودەکردنی هاوسەر و منداڵەکان و خزمان بەڵام سوپاس نەکرێت، بەخشینی دیاری واتە بە کردەوە سوپاسی جوهد و ماندوو بوونی هاوسەرت دەکەیت.

٣. پەیامی شەوق و شەیدایی: کاتێك یەکێك لە دوو هاوسەر ماوەیەك لەوی تر دوور دەکەوێتەوە بەسەردانی خزم و کەس بێت یان گەشتی درێژخایەن یان کورت خایەن، و لە گەڵ خۆیدا دیاریەك بۆ هاوسەرەکەی دەباتەوە، بە زمانی حاڵ پێی دەڵێت زۆر بیرم دەرکردیت و لە خەیچلم دەرنەدەچوویت.

٤. پەیامی دڵخۆش بوون بە سەلامەتی و ڕزگار بوون؛ کلتێك یەکێك لە دوو هاوسەر دووچاری کێشەو ڕووداوێك دەبێت، ئەویتر بە دیاریەك بەسەری دەکاتەوە بە زمانی حاڵ پێی دەڵێت: خۆشحاڵم بە سەلامەتیت سوپاس بۆ خوا.

٥. پەیامی پۆزش هێنانەوە: کاتێك یەکێك لە هدوو هاوسەر هەڵەیەك یان کەموکورتیەکی هەبێت بەرامبەر ئەوی تر، دواتر بە دیاریەك بەسەری دەکاتەوە، پێی دەڵێ: داوای لێبووردنت لێ دەکەم و لە کەموکورتیم ببوورە.

## هونەری پێشکەشکردنی دیاری:

**لە پێشکەشکردنی دیاریدا دەکرێ هونەر و ئەتەکێتی گونجاو لەبەرچاو بگیرێت:**

- **کتوپڕی:** زۆر گرنگە کە هاوسەر لە کتوپڕو و بێ چاوەڕوانی دیاری پێشکەش بکرێت.
- جوان هەڵبژاردنی دیاری: گرنگە لە کاتی هەڵبژاردنی دیاریدا بە زەوقێکی جوانەوە دیاریەکە هەڵبژێریت، و لە ئاستی کەسێتی هاوسەرت بێت، و بتوانێت سوودی لێ زەربگرێت.
- **پێچانەوەی دیاری:** پێچانەوەی دیاری بە بەرگێکی جوان ئەوەندەی تر دیاریەکە جوانتر دەکات ئەگەر بکرێت دەستەواژیەکی جوان لەسەر بەرگی دیاریەکە بنووسرێت.
- **شێوازی پێشکەشکردنی دیاری:** بێگومان پێشکەشکردنی دیاری شێوازی خۆی هەیە، دەکرێ جوانترین شێواز بە کاربهێنیت و بە شێوەیەکی زۆر جوان بەرەو رشووی هاوسەرت بچیت و بە دەستی ڕاست و شیاو دیاریەکەی پێشکەش بکەیت.

- **کاتی گونجاو:** بۆ پێشکەشکردنی دیاری پێویستە کاتی گونجاو هەڵبژێریت، ئەگەر بکرێ لە کاتێکدا بێت کە هەردوولا بەتەنیا بەیەکەوە بن ڕێگرێك نەبێت لە شێوازی جوانی پێشکەشکردنی دیاریەکە. جۆرێك لە ڕێزلێنانی زیاتری پێوە دیار بێت دیاریەکە چەند بچووك بێت ئەوەندە زیاتر بە بەهاتری دەکات، و هاوسەرت دڵی زیاتر پێ خۆش دەکات، چونکە مەبەست لە پێشکەشکردنی دیاری بە پلەی یەکەم بریتیە لە زیادکردنی خۆشەویستی لە نێوان هەردوو هاوسەر.

سەبارەت بە جۆرو شێوەی دیاری گرنگ نیە هەر چەند و چۆن بێت چونکە لە قسەیەکی کوردەواریدا هاتووە کە دەڵێت: ئەسپی خەڵاتی لە دەم و ددانی ناڕوانرێت، کەواتە دیاری هەرچەند بچووك بێت کاریگەری گەورەی هەیە بۆ کەسی بەرامبەر بە تایبەتیش هاوسەر بەڵام ئێمە وەکو پێویست گرنگیمان پێنەداوە ئەوەی لەڕاپرسیەکەدا هاتووە ئاماژەیە بەو ڕاستییە.

وەڵامی خوشکان لەم بوارەدا بەمجۆرەیە :

بەڵێ: ٤٩٪ ، نەخێر: ٤٦٪ ، سپی ٣٪

**ئایا لەبۆنەکاندا دیاری پێشکەش بەهاوسەرت دەکەیت؟**

| ماموستا+ خوێنکار/١٠١ | | | فەرمانبەر/٣٥ | | خانەی‌ماڵ/١١٥ | | | کۆی گشتی/٢٥١ | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| بەڵێ | نەخێر | سپی | بەڵێ | نەخێر | بەڵێ | نەخێر | سپی | بەڵێ | نەخێر | سپی |
| ٩٤ | ٧ | - | ٣٢ | ٣ | ١٠٦ | ٩ | _ | ٢٣٢ | ١٩ | - |

وەڵامی برایانیش بەمشێوەبوو :

بەڵێ: ١٩٧ ٦٣,٧٥٪

نەخێر: ١٠٩ ٣٥,٢٧٪

سپی: ٣ ٠,٩٪

## پرسیاری سیانزەیەم : ئایا داوای لێبوردن لە هاوسەرت دەکەیت ؟

هەڵە کردن شتێکی سروشتییە، و لە فەرموودەی پێغەمبەری ئازیزدا (ﷺ) هاتووە کە دەفەرموێت: کل بني آدم خطاء، وخير الخطائين التوابون)، واتە: هەموو نەوەکانی ئادەم هەڵە دەکەن، وە باشترین کەسێکیش کە هەڵە دەکات ئەوەیە کە تەوبە دەکات و پەشیمان دەبێتەوە، هەڵە کردن بەرامبەر بە هاوسەر گوناه کردنە و گوناه کردنیش پێویستی بە تەوبەکردن هەیە ، مەرجی تەوبە کردنیش ئەوەی کە ئەوەی پەیوەندی بە مفی بەندەکانەوە هەیە پێویستە لای ئەوان تەصفیە حسابی خۆت بکەیت، هەموو کەسێك هەڵەی لێدەوەشێتەوە ، بەلأم گرنگ دانپیانیەتی و پاشگەزبوونەوەیە لەو هەڵەیە، داوای لێبوردن کردن گەورەیی بەمرۆڤ دەبەخشێت بەتایبەتی ژن ومێرد لەکاتێکدا هەڵەیەك بەرامبەر یەکتردەکەن پێویستە داوای لێبوردن لەیەکتر بکەن وبەپەرستش وچاکەکردنی بزانن وپاداشتیان لای خوای گەورە ون نابێت . .

## ئایا داوای لێبوردن لە هاوسەرت دەکەیت ؟

| مامۆستا+ خوێنکار/١٠١ | | | فەرمانبەر/٣٥ | | خانەیمال/١١٥ | | | کۆی گشتی/٢٥١ | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| بەڵێ | نەخێر | سپی | بەڵێ | نەخێر | بەڵێ | نەخێر | سپی | بەڵێ | نەخێر | سپی |
| ٩٤ | ٧ | - | ٣٢ | ٣ | ١٠٦ | ٩ | _ | ٢٣٢ | ١٩ | - |

وەلآمی برایانیش بەمشێوەبوو :

بەڵێ:٢٦٣ ٪٨٥,١١

نەخێر: ٤٣ ٪١٣,٩١

سپی:٣ ٪٠,٩

## پرسیاری چواردەیەم : ئایا پۆشاکی خەو بەکاردەهێنیت ؟

گرنگیدان بەپۆشاکی خەو جگە لەوەی کە ئارامی بەجەستە دەبەخشێت، دەبێتە مایەی دروستکرنی خۆشەویستی وزیاتر وابەستەکردنی هەردوو هاوسەر بەیەکتریەوە، لە قورئانی پیرۆزدا خوای گەورە بە پیاوان دەفەرموێت: **نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ فَأْتُوا حَرْثَكُمْ أَنَّى شِئْتُمْ وَقَدِّمُوا لِأَنفُسِكُمْ وَاتَّقُوا اللَّهَ وَاعْلَمُوا أَنَّكُم مُّلَاقُوهُ وَبَشِّرِ الْمُؤْمِنِينَ**(223)سورة البقرة

واتە ژنەکانتان کێڵگەن بۆتان بچنە ناو کێڵگەکانتان چۆن ویستتان، بۆ خۆتان پێشکەش بکەن، واتە ئەو شتانەی پێویستە بۆ کرداری بەیەك گەیشتن ئامادەباشی بۆ بکەن، بێ گومان جل و بەرگ کاریگەری گەورەی هەیە لەسەر کەمەندکێش کردنی هەردوو هاوسەر بۆ لای یەکتر بە تایبەتیش ژن پێویستە زۆر گرنگی بە جەمالیەت و جوانی پۆشاکی خەوتن بدات، چونکە پیاوان بە پێی توێژینەوەکان لە ڕێگەی چاوەکانیانەوە دەوروژێن، لەبەر ئەوە پێویستە ئەو لایەنە فەرامۆش نەکرێت و لە بەرچاو بگیرێت.

لەبەرئەوەو چەندین هۆکاری تر پێویستە گرنگی پێبدەین وبگەڕێین بەدوای پۆشاکی سەرنج ڕاکێشدا . ئەنجامی وەڵامەکانی ئەم پرسیارەش بەمجۆرەی خوارەوەیە :

بەڵێ :٥٦,٣٥٪ .

نەخێر :٣٢,٥٩٪ . سپی: ١١٪

ئایا پۆشاکی خەو بەکار دەهێنیت ؟

| ماموستا+ خوێندکار/١٠١ | | | فەرمانبەر/٣٥ | | خانەیمال/١١٥ | | | کۆی گشتی/٢٥١ | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| بەڵێ | نەخێر | سپی | بەڵێ | نەخێر | بەڵێ | نەخێر | سپی | بەڵێ | نەخێر | سپی |
| ٩٤ | ٧ | - | ٣٢ | ٣ | ١٠٦ | ٩ | _ | ٢٣٢ | ١٩ | - |

وەڵامی برایانیش بەمشێوەبوو :

بەڵێ: ٢٣٨ ٧٧٪

نەخێر: ٥٩ ١٩٪

سپی: ١٢ ٣,٨٨٪

گرنگیدان بەبۆنخۆشی وپۆشاك یەكیكە لەئاكارو ڕەوشتەجوانەكانی سەرداری مرۆڤایەتی (ﷺ) لەبەرئەوە پێویستە لەسەر مرۆڤی موسوڵمان كە گرنگی تایبەتی پێبدات ، وەبە بەشێك لە ئەركە ئایینیەكانی خۆی بزانێت ، كاتێك تۆی بەرێز چاوەڕێی هاوسەرت دلی نەچێت بەلای قەدەغەكراوەكاندا پێویستە لە سەرت كە دڵی رابگریت و بەبۆنخۆشی وپۆشاكی پاكو خاوێن بەلای خۆتیدا رابكێشیت ، هەروەك پێویستە گرنگی بەژووری نووستن بدەن ، بەهەمان شێوە پێویستە گرنگی بە پۆشاكی خەو بدەن چونكە كاریگەری زۆری هەیە لەسەر پەیوندی هاوسەرێتیتان ..

## پرسیاری پانزە یەم: ئەم پرسیارە تایبەتە بە پیاوان :
## ئایا هیچ کات لێدانت بەکارهێناوە ؟

برا بەڕێزەکان ژیانی هاوسەرێتی یانی خۆشەویستی و لە ناو یەکدا توانەوە ، یانی بەخشینی ژیان بەنەوەی نوێ، یانی پێشکەش کردنی ئەزموون ، هاوسەرت واتا دایکی مندالّت ، واتە شەریکی ژیانت، واتە بەشێك لە تۆ ، ئەو نیوەی تۆیە و تۆش نیوەی ئەوی، ناکرێ مرۆڤ لە خۆی بدات و ئازاری جەستە و گیانی خۆی بدات، وریا بە بەهەڵە لەو ئایەتە تێنەگەیت کە دەفەرموێت (واضربوهن) چونکە یەکەم کەس بە پێغەمبەری خۆشەویستمان گەیشتووە، حالّەتەکانی هەموو ژن ومێردێك زۆربەی لەژیانی خێزانی ئەودا ڕوویداوە ،بەلاّم پێم بلّێ لەچ کاتێکدا یان لە چ فەرموودەیەکی پێغەمبەردا (ﷺ) باس لەوە دەکات کە لێدانی بەکا رهێنابێت ؟!! بەلّکو بۆ تەنها یەکجاریش لێدانی بەکارنەهێناوە ، لەوەش گرنگتر دەفەرموێت ( ما اکرمهن الا کریم وما اهانهن الا لئیم )واتە: هیچ کەس ڕێزی لێ نەگرتوون جگە لەوانە نەبێت کە خۆیان زۆر بەڕێزن، وە هیچ کەش ئیهانەو سوکایەتی پێ نەکردوو جگە لەوانە نەبێت کە

خۆیان زۆر سوك و بێ ڕێزن، وە دەفەرموێت :(خیرکم خیرکم لاهله وانا خیرکم لاهلی )، باشترینتان باشترینتانە بۆ هاوسەرەکەی وە من لە هەمووتان بۆ هاوسەرەکانم باشترم، وە لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە کە دەفەرموێت: بلغني انه هناك رجال یضربون نساءهم، الا انهم لیسوا بخیارکم، خیرکم خیرکم لاهله وانا خیرکم لاهله) ، واتە پێم گەیشتووە لەوێدا پیاوانێك هەن لە هاوسەرەکانیان دەدەن، ئاگادار بن ئەوانە پیاوە باشەکانتان نین، بەڵکو باشترینتان ئەوانەتانە کە بۆ هاوسەرەکانی باشە وە من لە هەمووتان باشترم بۆ هاوسەرەکانم. جابەڕاستی جێی داخە کە هەندێك مێرد دڵیان بهێنێت لە ژنەکانیان بدەن !! دەدستخۆشو دەمخۆش بۆ ئەوانەی وشەی جوان وناسکانە بەکاردەهێنن ، وریا بە برام ئەگەر تائێستا لێدانت بەکار هێناوە بۆ لەمەودوا تەنها ئەو دوو فەرموودە یەت سەرەوە بهێنە بەرچاوی خۆت . ئەنجامی وەڵامی ئەم پرسیارەش بەمجۆرە یە :

بەڵێ: ١٠٧ ٣٤,٦٢ ٪

نەخێر: ٢٠١ ٦٥٪

سپی : ١ ٠,٣٪

# بەشی دووەم

پرسیارەکانی ئەم بەشە تایبەتە ژنانەوە، واتە پرسیارەکە لە ژنان کراوە بۆ ئەوەی پیاوان بزان و خواست و داوای هاوسەرەکانیان چیە و چۆن و چی بکەن بۆ ئەوەی هاوسەرەانیان ڕازی بکەن و دڵخۆشیان بکەن، لەبەر ئەوەیە کە ئەم پەیڤەی خوارەوەمان بۆ پیاوان نووسیوە

# بۆ برایانی بەڕێز
# ڕازەکانی هاوسەرەکانتان بخوێننەوە

وتەیەکی کورت بۆ برایانی بەرێزم :

برایانی بەڕێز لە وتەیەکی کورتدا دەمەوێت مەسەلەیەکی گرنگ بیری خۆمو ئێوەش بخەمەوە ،ئەویش بریتیە لە چۆنیەتی مامەڵە کردن و ئاخاوتن لەگەڵ هاوسەری ژیاندا ، جێی خۆیەتی شەفافانە لەگەڵ یەکتر بدوێین‌و لە خۆمان بپرسین : بۆچی کاتێك لە هەر شوێنێکی کار بین لەگەڵ دەستە خوشکەکانماندا ، بەردەوام لە هەوڵیَ ئەوەداین کە جوانترین و شیاوترینِ وشەو ڕستە بەکار بهێنین نەبا دڵی بەرامبەرمان یان هەستی بریندار بکەین .

بەرامبەرەکەمان، پیاو یان ئافرەت بێت گرنگ نیە، ئەوەی لامان گرنگە ناسك مامەڵە کردنە لە گەڵیاندا. بێگومان جۆری مامەڵەی پیاو لەگەڵ ئافرەتدا ناسکتر دەبێتەوە بە ڕادەی ناسکی و دنیا پڕ سۆزەکەی ئافرەت . جێی خۆیەتی لە خۆمان بپرسین؟ ئەو ئافرەتانەی من زۆر ناسکانە مامەڵەی لەگەڵ دەکەم تەنیا

/

پەیوەندیە ئینسانیەکەیە پێکمانەوە دەبەستێتەوە ، ئە ی بۆچی ئەو پەیوەندی یە ئینسانیە لەبەر چاو ناگرین لەگەڵ هاوسەری خۆماندا، کەجگە لەپەیوەندی ئینسانی پەیوەندی (هاوسەرێتی)ش پیکمانەوە دەبەستێتەوە ، کەخوای گەورە زۆر جوان وەسفی ئەو پەیوەندیەمان بۆدەکات :[ومن اياته ان خلق لكم من انفسكم ازواجا لتسكنوا اليها وجعل بينكم مودة ورحمة ان في ذلك لايات لقوم يتفكرون ][هن لباس لكم وانتم لباس لهن ]

واتە : لەبەڵگەو ئایەتەکانی خوایە کە لە خۆتان هاوسەری ژیانی بۆ دروست کردون بۆئەوەی ببێتە مایەی دڵئارامیوسەکینەتی دەرونتان ، وەخۆشەویستی و میهرەبانی لەنێوانتاندا دروستکردوە ، لەوەشدا بەڵگەو ئامۆژگاری هەیە بۆ ئەوانەی کەخاوەن بیروهۆشن، لەئایەتی دووەمدا دەفەرموێت: هاوسەرەکانتان پۆشاکن بۆ ئێوە وە ئێوەش پۆشاکن بۆ ئەوان . زۆر ڕوون و ئاشکرایە، پەیوەندی پۆشاك چیە بەجەستەی مرۆڤەوە ، وە جەستەش حەزی لەچ جۆرە پۆشاکێکە (نەرم ، ناسك ، بۆنخۆش ، ئووتووکراو ،....هتد) .

ئەوە ش ئامارەیە بۆ هەردوو هاوسەر کە پێویستە وابن بۆ یەکتر بۆنخۆش ونەرم ونیان و بێ گرێوگۆڵە بن و هتد .

براكانم باپرسيارێك لەخۆمان بكەين :

ئايا رۆژێك لەرۆژان هەركام لە ئێمە هەوڵمانداوە بارى دەروونى خێزانەكەى بخوێنێتەوەو بناسێت ؟!وە لەخۆى بپرسێت ئايا هاوسەرەكەم ؟:

١. چۆن داواكردو زەحمەتى چەندپياو ماقوڵم دا هەتا كەسوكارى رازيبوون ؟
٢. بەچى توورەو بێزار دەبێت ؟
٣. بە چى هێمن وئارام دەبێتەوە ؟
٤. هەستو سۆزى چۆنە بەرامبەرم ؟
٥. چ كاتێك زۆر خۆشە بەلايەوە ؟
٦. چاوەرێى چيە لە من ؟

ئەمانەو چەندين پرسيارى تر كە وەڵامەكانيان رۆژانە بە ئاسانى دەستمان نەخستووە ، جا هۆكارەكەى يان خۆمان بووين يا هاوسەرەكانمان لە شەرمدا نەيانتوانيوە دەريبرن . ئەو وەڵامانەى لەم راپرسيەدا هاتووە نەفەلسەفەيە ونەئەدەبياتێكە دارێژرابێت لەهيچ سەرچاوەيەكى نەعەرەبى نەبيانى تر وەرنەگيراوە ، بەڵكو وەڵام و زمانحاڵى هاوسەرە بەرێزەكانە كە تەعبير لەناخى خۆيان دەكەن ، ئێوەى برا زۆر پێويستە بزانن

که هاوسەرەکانتان چەندە ئێوەیان لا بەرێزو خۆشەویست و مەبەستە ئەگەر ئەوە نەنرخێنن هەرگیز ناتوانن ئامادەیان بکەن بۆ ئەوەی وەلأمی حەزە جۆراوجۆرەکنتان بدەنەوە ، بەتایبەتی لە بواری زایەندیدا کە گیروگرفتێکی رۆژانەیە بۆئەمرۆ چەکێکی کوشندەیە لەبەرامبەر پیاواندا دەتەقێنرێت ، فەرموون لەگەڵماندبن بۆ بیستنی رازو نیازو داخوازی هاوسەرەکانتان .................

## پرسیاری یەکەم : چی هاوسەرەکەت تووڕەو بێزارت دەکات ؟

وەڵام:

١. تووڕەبوونی مێردەکەم .
٢. قسەی رەق وخۆفەرز کردن .
٣. کاتێك لەبەرخۆیەوە قسەدەکات .
٤. هەست رانەگرتنم و گوێپێنەدانم .
٥. دەرنەبرینی خۆشەویستی و هەستو سۆز .
٦. گوێنەدان بە پێداویستیەکانی ماڵ.
٧. کاتێك باسی خێزانی تر دەکات و بەراورد بەکەسانی تر دەکات .
٨. زۆر دووبارە کردنەوەی ژن هێنان .
٩. یارمەتی نەدانم لەپەروەردەکردنی منداڵەکاندا .
١٠. دواکەوتن لەگەڕانەوە بۆ ماڵ وئاگادارنەکردنەوە .
١١. فەرزکردنی تەنها رای خۆی .
١٢. گوێنەگرتن بۆ قسەکانم وبەهەندنەگرتنی .
١٣. کاتێ دەبینم لەجلوبەرگ وبۆنخۆشیدا ئیهماله ،هەتا لەشتی ماڵەوەش .

١٤. زۆر لەماڵ دەرچوون .

١٥. من حەز لەسەردان دەکەم ،بەلاَم هاوسەرم حەزی لێی نیە .

١٦. بێ وەعدی .

١٧. بەکەم سەیرکردنی سەرقاڵیوماندوێتیم نەنرخاندنیو دەستخۆشی نەکردن .

١٨. زۆر سەرقاڵی هاوسەرم ومەشغەڵت وجەنجاڵی .

١٩. رێگرتن لەسەردانی ماڵی باوکم بەبێ هۆ .

٢٠. ريعايەت نەکردنی باری تەندروستيم وتەکليف کردن.

٢١. بێ ئاگادارکردنەوەم هێنانەوەی ميوان .

٢٢. لەکاتی خەوتندا پشتم تێبکات بەهەرهۆيەك بێت .

٢٣. کاتێك شتم لێبشارێتەوە .

## پرسیاری دووەم: کێشەی خێزانیتان بەزۆری لەچیەوە سەرهەڵدەدات ؟

کێشەی خێزانی هۆکاری زۆرە ،ولەخێزانێکەوە بۆ خێزانێکی دەگۆڕێت ، هەندێ جار هۆکارەکان بابەتین وهەندێك جاری تر خودین ،هەندێك جاریش هۆکاری دەرەکی کێشەخێزانیەکان دەخولقێنێت، بۆ ئەم مەبەستە ئەم پرسیارەمان ئاراستەی ژنان کردووە :

**کێشەی خێزانیتان بەزۆری لەچیەوە سەرهەڵدەدات ؟**

*وەلام :*

١. لەسەردانی زۆر بۆماڵی کەسوکاری ونەگەڕانەوەی بۆ ماڵ .
٢. کەخۆم بەماڵەوە خەریك دەکەم وئاوبەکاردەهێنم بێتاقەتم دەکات .
٣. شتی بچووکم لێ گەورە دەکات .
٤. نەخوێندنەوەم وحساب بۆنەکردنم .
٥. درەنگ گەڕانەوە بۆ ماڵ وسەفەرکردن .
٦. قسەی رەقی خەسووم .
٧. بێئارامی هاوسەرم .

٨. ئیهمالی هاوسەرم وگوێنەدانی بەماڵەوە .

٩. هیچ بایەخ بەزەروراتی ماڵ نادات وخەریکی کەمالیاتە .

١٠. ئیهمال کردنم لەلایەن هاوسەرمەوە .

١١. سەرقاڵی بەمنداڵەوە .

١٢. تدخولی زۆری ماڵی خەزوورم .

## پرسیاری سێیەم : ئایا بەربەستی بەردەم ئەنجامدانی پرۆسەی هاوسەرگیریت چی بوو ؟

بێگومان هەموو کارێك بەرلەدەستپێکردنی رووبەرووی هەندێك بەربەست ورێگر دەبێتەوە ،پرۆسەی هاوسەرگیریش بەدەر نیە لەبوونی بەربەست بەر لە دستپێکردنی ،ئەوەش لەکەسێکەوە بۆ یەکێکی تر دەگۆرێت، جارهەیە کور یان کچ خۆی بەربەستە لەبەردەم پرۆسەی هاوسەرگیری خۆیدا ، جاری تریش هەیە کۆمەلگە یان هەندێك هۆکاری بابەتی، بەهەرحاڵ ئێمە لێرەدا پرسیارێکمان ئاراستەی خوشکان کردووە بزانین وەلأمیان چی؟

**ئایا بەربەستی بەردەم ئەنجامدانی پرۆسەی هاوسەرگیریت چی بوو ؟**

وەلأمی زۆرێك لە خوشکان ئەمانەی خوارەوە بوو:

١- ماڵەوەمان .

٢- کێشەی خێزانی .

٣- خوێندن .

٤- نەبوونی ئازادی لەماڵەوە .

٥- جیاوازی ئاستی لەیەك تێگەیشتن .

٦- کاریگەری کۆمەڵگە .

٧- لەبەرئەوەی کچی گەورەی ماڵ بوو ئەرکی ماڵەوەی لەسەربوو ،واتە بەهۆی ئەوەوە دەستیان دەنا بەرووی داواکارەکانەوە .

٨- گەورە بەبچووك .

٩- دەستێوەردانی خزمان .

١٠- جوانی .

١١- ترسی دانیستن لەگەڵ ماڵی خەسوو.

١٢- باری ئابووری .

**پرسیاری چوارەم: دیارترین کێشەی خێزانیتان لەچیەوە سەرهەڵدەدات ؟**

* ژیانی بێگرفت نیە و خێزانیش بەهەمان شێوە بەلاَم هەندێك کێشە ژیانی خێزانی بەتەواوی دەشێوێنێت ، بزانین دیارترین کێشەی خێزانی لای خوشکان چیە ؟

١- ماڵی خەزوورم زۆر دەست لەکاروباری ژیانمان وەردەدەن .
٢- کەم دەرامەتی .
٣- منداڵ زۆری و رانگەیشتن بەپەروەردەکردنیان .
٤- کرێچیەتی .
٥- هاوسەرم کێشەی بچووك زۆر گەورە دەکات وزۆر دەیلێتەوە ومنیش بەرگەی ناگرم .
٦- دەست بلاَوی هاوسەرم .
٧- بێ وەعدی هاوسەرم .
٨- توورەبوونی زۆر وبەردەوام.
٩- ئینکاری زۆر.
١٠- نەبوونی ئازادی لەژیانی خێزانیدا .

١١- تێنەگەیشتن لەیەك .

١٢- گوێنەدان بەحەزو داواكاری و پێداویستیەكانم .

١٣- تێكەڵاوی خزمایەتی لەرادەبەدەر .

١٤- بەردوام دەربرینی نارەزایی و بۆڵەكردن .

١٥- داواكاری نابەجێ ودوور لە شەرع .

١٦- شكاندنم لای منداڵ وخەڵكی تر .

## پرسیاری پێنجەم : خۆشترین کات بەلاتەوە چ کاتێکە؟

*ژیان کاتی خۆش وناخۆشی تیایە بابزانین خۆشترین کات بەلای خووشکانەوە لەژیانی خێزانیدا چ کاتێکە ؟

١- کاتە ئارامەکانی ناو ماڵ وهێمنی و دووری لەئاژاوە.

٢- ئەوکاتانەی کەتوانیبێتم داخوازیەکانی هاوسەرم بەجێبێنم .

٣-ئەوکاتانەی بەخێزانی دانیشتووین و ئامۆژگاری منداڵەکان دەکەین .

٤- ئەوکاتانەی هاوسەرم دەگەڕێتەوە بۆ ماڵ.

٥- کاتێك سەیرانی خێزانی دەکەین .

٦- ئەوکاتانەی پەرستشیی بەکۆمەڵ دەکەین لەگەڵ هاوسەرم و لەخوا دەپاڕێینەوە .

٧- ئەکاتانەی کە هاوسەرم پێم دەلێت خۆشم دەوێیت .

٨- ئەکاتانەی دڵخۆشم دەکات بەقسە ی خۆش یان بەجێهێنانی داخوازیەکەم .

٩- کاتێك هاوسەرم رێزم لێدەگرێت ودەمخوێنێتەوە .

١٠- هاوسەرم لەش ساغو بێ کێشە بێت .

**١١- كاتێك له گەڵ هاوسەرم دادەنیشین وراز بۆ یەکتر دەردەبرین .**

**١٢- كاتێك لەگەڵ هاوسەرم دەچینە دەرەوە و سەردانی ماڵی خزم ودۆستەکانمان دەکەین .**

**١٣- كاتێك هاوسەرم دەستخۆشیم لێدەکات و ماندوویەتیم دەنرخێنێت .**

**١٤- كاتێك هاوسەرم منداڵەکان له ئامێز دەگرێت .**

## پرسیاری شەشەم : بەچی هێمن وئارام دەبێتەوە؟

هۆکار زۆرە بۆ هێمنی وئارامی بە تایبەتی کاتێك هەڵچوون و تورە بوون دێتە ئاراوە، تورەییش وەکو ئاگر وایە ، ئاگریش تەنها بە ئاو دەکوژێنرێتەوە، کەواتە کاتێك پیاو تورە دەبێت پێویستە سارد بکرێتەوە، با بزانین هاوسەرە بەرێزەکان بەچی هێمن و ئارام دەبنەوە ؟

١. مامەڵەی شیرین وقسەی خۆشی هاوسەرم .
٢. دان نان بەهەڵەی خۆیداو داوای لێبوردن کردن .
٣. بەگەرانەوەی هاوسەرم بۆ ماڵەوە .
٤. بەئارامی مامەڵەکردنی هاوسەرم لەکاتی توورەبوونمدا .
٥. کەهاوسەرم دڵنەواییم بکات .

## پرسیاری حەوتەم : پێشنیارت چیە بۆهاوسەرت ؟

برا بەڕێزەکان پاش ئەوەی کەزانیتان هاوسەرەکانتان بەچی تووره دەبن وچی ئارامیان دەکاتەوە وکاتە هێمن وئارامەکان وخۆشەکان چیە بەلایانەوە ،لەکۆتاییدا بازانین پێشنیاریان چیە بۆ بەڕێزتان ؟

١. با کێشەکانی ژیان کارنەکاتە سەرپەیوەندیمان .
٢. کاتی تایبەت تەرخان بکات بۆ بەیەکەوە دانیشتن وئالوگۆرکردنی راوبۆچوون ودروستکردن کەشوهەوای خۆشەویستی .
٣. کات تەرخان بکات بۆ پەروەردە کردنی منداڵەکان .
٤. باسەماحەت و لێبوردنی هەبێت .
٥. هەوڵبدات هەمیشە رووخۆش ودەم بەخەندە بێت .
٦. زۆر لەخۆی رازی نەبێت و حساب بۆ بەرامبەرەکەی بکات .
٧. زیاتر غەمی ماڵ ومنداڵی خۆی بێت .
٨. راوێژم پێبکات وبەشدارم بکات لەبریارەکاندا .
٩. تەدەخول نەکردن لەکاری یەکتردا .
١٠. بادڵ بۆیەکتربکەینەوە وشت لەیەکتر نەشارینەوە .

١١. هاوسەنگی بکات لەنێوان ژیانی خێزان ودەرەوەدا .

١٢. پاراستنی خۆشەویستی نێوانمان .

١٣. بامیزاجیانە مامەڵە نەکات .

١٤. لای منداڵەکان نەمشکێنێت .

١٥.سنووری شەرع بپارێزێت و داوای منداڵانە نەکات .

١٦.ئەوروخۆشیەی لە دەرەوە هەیەتی لەماڵەوەش هەیبێت .

١٧.قسەی دەرەوە کاری تێنەکات و ژیانی خێزانی نەشێوێنێت .

١٨.دان بەهەڵەکانیدا بنێت وداوای لێبوردن بکات .

١٩.مافی کەسوکاری بدات بەڵام لەسەر حسابی مافی هاوسەرەکەی نەبێت .

٢٠.خۆشەویستیم بۆ دەربرِێت .

٢١. باحساب بۆحەزەکانی منیش بکات وگرنگی بە پێداویستیەکانی ماڵ بدات .

# بەشی سێهەم

پرسیارەکانی ئەم بەشە کە حەوت پرسیارە لە پیاوان کراوە تاکو ژنان رازی هاوسەرەکانیان بخوێننەوە و لە دەمی خۆیانەوە خواست و داواکانیان ببیستن، ئێمەش بۆمان خستوونەتە دوو تویچی ئەم چەند لاپەڕەیە تاکو بەرچاو ڕۆشنتر بن لە مامەڵەی هاوسەرەکانیان.

١

## بۆخوشکانی بەڕێز: ڕازەکانی هاوسەرتان بخوێننەوە

لەئەنجامی ئەو ڕاپرسیەی کە لەنێوان (٣٠٩) پیاودا کرا لە کۆی ئەو ٢٦ پرسیارەی لێمان کردن وەڵامەکانیان بەم شێوەیەی خوارەوە بوو :

**پرسیاری یەکەم : بەربەستەکانی دروستکردنی ژیانی خێزانیت چی بوو؟**

وەڵامەکان بەمشێوەیە بوو :

١. دەستکورتی ونەداری .
٢. نەبوونی جێگاو نیشتەجێبوون .
٣. خوێندن .
٤. دواکەوتوویی کۆمەڵگا .
٥. داواکاری زۆری ماڵی کچان .
٦. باری ناجێگیری کوردستان.
٧. بێکاری ودانەزراندن .
٨. نەبوونی رۆشنبیری پێویست .
٩. بوونی هەندێ عورفی عەشایەری نابەجێ.

## پرسیاری دووەم: چی هاوسەرەکەت توورەت دەکات ؟

خوشکی بەرێزم ئەوەی لەوەلآمی ئەم پرسیارەدا دەیبینیت پێویستە خۆت لەسەرەتای گەیشتن بەیەکتر لەگەڵ هاوسەرتدا هەوڵت بۆدابێت بۆئەوەی زۆر بەرچاو ڕۆشنانە مامەڵە ی لەگەڵدا بکەیت ،هەروەکو ئەوەی کە خێزانی (شورەیحی قازی )کردوویەتی لەگەڵیدا کەبووە هۆی ئەوەی بەردەوام شورەیح باس لە چاکیەکانی هاوسەری بکات لەهەموو کۆڕێکدا ، ئامادەبوانیش پرسیاری لێدەکەن لەبەرچی ؟ لەوەلآمدا دەڵێت : ئەو شەوەی کە هاوسەرم گواستەوە ، دوو ڕکات نوێژم دابەست کەسەلامم دایەوە بینیم هاوسەریشم لەدوامەوە سەلام دەداتەوە بێئەوەی هیچ بڵێم منی کردە ئیمامی خۆی و لەگەڵ دوعاکانمدا ئامینی دەکرد ، دواتر دەستم برد بۆدەستی ،وتی ئارام بگرە ، حەزدەکەم هەندێك پرسیارت لێبکەم ، منیش وتم فەرموو : وتی :

- بەچی توورە دەبیت و چی زۆربێزارت دەکات ؟

- حەزلە چ جۆرە مامەڵەیەك دەكەیت وچ جۆرە خواردنێكت حەزلێیە ؟
- ڕقت لە چ جۆرە خواردنێكە ؟
- حەزدەكەیت چۆن سەردانی ماڵی باوكم وخزمانم بكەین یائەوان چۆن سەردانمان بكەن ؟
- میوانداری كێت پێخۆش یان ناخۆشە ؟

هەروەها چەند پرسیارێكی تر ، دەڵێت منیش بەوردی و لەسەرخۆ وەلأمم دایەوە ، لەو ڕۆژەوە تائەمرۆ كە (٣٠)ساڵ تەمەنمان بەڕێكردووە تەنها یەكجار لێی تووڕەبووم ئەویش خەتای من بوو .

خوشكە بەڕێزەكانم ، ئەگەر وەكو خێزانی شورەیحتان كردووە دەستتان خۆشبێت وژیانی خۆش پیرۆزتان بێت ، وە ئەگەر واتان نەكردووە  ئەوا نەچووە بچێت فەرموون لەگەڵ وەلأمی هاوسەرەكانتاندا بن و بزانن چی تووڕەو ماندوو و بێزاریان دەكات :

١. كاتێك شەو یان كاتەكانی تر درەنگ دەچمە ماڵەوە خۆی تووڕە دەكات لەجیاتی پێشوازی گەرم .

٢. داواكردنی كەلوپەلی ناومالّ زیاد لە پێویست و منیش توانای دارایيم سنووردارە .

٣. كاتێك داواكاریەكانم جێبەجێناكات .

٤. كە شتم لێدەشارێتەوە .

٥. چوونەدەرەوە بێ ئاگاداركردنەوەم .

٦. كاتێك كێشەی دەرەوە دێنێتە ناو مالّ .

٧. كاتێك حەزلەكاری سەجێی بكەم ⁄ وئەو ئامادە نەبێت .

٨. ناشكوری كردن وقسەی ناشیرین وتن بەمندالّەكان .

٩. مراعات نەكردنی شعورم .

١٠. زۆرچونەوە بۆمالّی باوكی و رێزنەگرتنی باوكو دایكو كەسوكارم .

١١. كاتێك بێ هۆ ناوچاوی دەدات بەیەكدا .

١٢. كاتێك دەنگی بەسەرمدا بەرز دەكاتەوە بەتایبەتی لای مندالّەكان ..

١٣. ئیهمالی وگوێنەدان بەكاروباری ناومالّ.

١٤. بێرێزی بەرامبەر میوان .

١٥. باسكردنی مالّی باوكو خزمانم بەخراپ .

١٦. بەراوردکردنی خۆمان بەکەسانی سەرووخۆمان لەباری ژیاندا .

١٧. حەزنەکردنی لەسەردان .

١٨. لەکاتی گەڕانەوەم بۆماڵ ڕووی گرژبێت ولەجیاتی بەخێرهێنانەوەم بۆڵە بکات .

١٩. زۆر پرسیارکردن و خۆهەڵقورتاندن لە هەموو شتێکدا .

٢٠. گرنگی نەدان بەپاکو خاوینی .

٢١. کاتێك دەچمە ماڵەوە خواردن ئامادە نەبێت .

٢٢. ئیلتیزام نەبوونی بە پۆشاکی شەرعی .

٢٣. داننەنانی بەهەڵەکانیداو داوای لێبوردننەکردن .

٢٤. کاتێك لەمنداڵەکان تووڕە دەبم لەسەریان هەڵدەداتێ.

٢٥. وەلامدانەوەم لەکاتی تووڕەبوونمدا .

٢٦. دووبارە کردنەوەی وتەو کردارێك کە دەزانێت من تووڕەدەکات .

٢٧. لەکاتی بوونی کێشەی تایبەتی خۆمدا موراعاتم ناکات .

٢٨. بەچاوی ماددەوە سەیری ژیان کردن .

٢٩. کەپێویستیم بەپشوودان بێت ژاوەژاو کردن لەگەڵ منداڵەکان .

٣٠. لەبەجێهێنانی ئەرکی سەرشانمدا لەجیاتی هاوکاری بەربەستم بۆ دروست دەکات .

٣١. زۆربێزاری دەربڕین وبڵێ تا ئێستا خۆشیم لێت نەدیوە .

٣٢. کێشەی ناوماڵ وگوێڕایەڵ نەبوون .

٣٣. سووربوونی لەسەر ڕاوبۆچونی خۆی ئەگەرچی هەڵەش بێت .

٣٤. خانە گومانی و چاودێری کردنم .

٣٥. ئینکاری کردن و مامەڵەی ڕەق .

٣٦. دەستێوەردانی ماڵی باوکی لەکاروباری ژیانمان.

٣٧. پرسیارکردنی زۆر لەکوێ ،بۆکوێ ،بۆچی دەچیت ؟

## پرسیاری سێهەم : بەچی هێمن وئارام دەبیتەوە ؟

بێگومان لەگەڵ بوونی هۆکاری تووڕەکردن وتووڕەبوون هۆکاری هێوربوونەوە وئارام بوونیش هەیە ،خوشکی بەڕێزم هۆکاری تووڕەبوونی هاوسەرت بۆدەرکەوت لەمیانەی وەڵامی پیاوان لەهۆکارەکانی تووڕەبوونیان فەرموو لەگەڵمدا بە ئەوەی هۆکارەکان یان ڕێگاکانی هێورکردنەوەی هاوسەرت بزانیت تاکو بتوانیت زوو ئاو بکەیت بەوئاگری تووڕەبوونەی کە ژیانتان لێدەکات بەدۆزەخ . ئەوەی خوارەوە هۆکارو ڕێگای ئارامکردنەوەی هاوسەرەکانتانە :

١. دوو قسەی خۆش (دەمە چیت لێ کەمە) ؟
٢. خەندەی سەرلێوەکانی هاوسەرم لەکاتی تووڕەبوونمدا .
٣. یادکردنەوەی خوای گەورە .
٤. بەڕازاندنەوەی خێزانم بەجوانترین شێواز.
٥. بەدڵخۆشیو ڕووخۆشی خێزانم .
٦. بەلێبوردەیی هاوسەرم.

٧. بەگرنگیدان بەپاکوخاوێنی ناوماڵ.

٨. بەگوێگرتنی خێزانم لێم .

٩. بەدەست پێشخەری خێزانم لەئاشتکردنەوەدا .

١٠. داخوازیەکانم جێبەجێ بکات .

١١. خێزانم دان بەهەڵەکانیدا بنێت وداوای لێبوردن بکات .

١٢. وەڵامندانەوەم لەکاتی تووڕەبوونمدا .

١٣. ڕێکوپێکی ناوماڵ .

١٤. کاتێك دەچمەوە ماڵ خێزانم لەماڵەوە بێت .

١٥. پاڵپشتم بێت لەکاتی تەنگژەدا.

١٦. دروستکردنی خواردن لەکاتی خۆیدا .

١٧. کاتێك خێزانم گورجوگۆڵە لەعیبادەتەکاندا .

١٨. ڕووخۆشی وسەفەرکردن .بەڕازیبوون بەبەشەی خواپێیداوین .

## پرسیـاری چـوارەم:دیارتـرین کێشەو گرفتی خێزانیتان چیە ؟

١. زۆرتووڕەیی خێزانم .

٢. نەبوونی ودەستکورتی .

٣. ڕۆیشتنەوەی خێزانم بۆماڵی باوکی زیاد لە پێویست .

٤. دەستێوەردانی دەرەکی لەژیانی خێزانیمان .

٥. خێزانم قەناعەتی نیە وداوای دەوڵەمەندیم لێدەکات .

٦. خێزانم بەدەم داواکاریەکانمەوە نایەت بەتایبەتی سەجێیی .

٧. خێزانم لیم تێناگات .

٨. بەرپەرچدانەوەی خێزانم و دەمەدەمەکردن لەگەڵمدا.

٩. ساردوسڕی خێزانم کەهیچ جۆرە خۆشەویستیەکی‌تیانابینم .

١٠. کرێچێتی و بەرتەسکی ماڵ .

١١. دانیشتنمان لەگەڵ ماڵی باوکم .

١٢. جیاوازی ئاستمان .

١٣. حەزدەکات من هبتواوی تەسلیمی عەقلی ئەوبم .

١٤. کەمتەرخەمی لەڕاپەڕاندنی ئیشوکاری ناوماڵ .

١٥. ناکۆکی ماڵی باوکم وخەزوورم .

١٦. بێکاری .

١٧. نەگونجانی خێزانم لەگەڵ کەسوکارم .

/

## پرسیاری پێنجەم : ئایا کێشەکان بەزۆری لەچیەوە سەرهەڵدەدات ؟

سەرهەڵدانی کێشە هۆکاری خۆی هەیە جابزانین کێشەخێزانیەکان بەهۆی چیەوەیە بۆئەوەی سەرچاوەکەی دیاری بکەین دواتر دەتوانین چارەسەری بۆدیاری بەکین. خوشکی بەڕێزم ئەبەشەی خەتای تۆیە پێویستە لای خۆتەوە چارەسەری بکەیت ،چونکە هەموو دووهاوسەرێك سێ ڕێگە لەبەردەمیانداهەیە بۆیان هەیە هەرکامیان هەڵبژێرن کەئەمانەی خوارەوەیە :

١. ژیان بەسەربردنێکی دۆزەخیانە وپڕ لەکێشە کە هەرددلاو منداڵەکان وکۆمەلگەش بەخۆتانەوە دەسووتێنن .
٢. جیابوونەوە لەیەکتری بۆیەکجاری! کەئەمەش چارەسەرنیە مەگەر هیچ بوارێك نەمێنێ.
٣. گۆڕانکاری لەخۆتاندابکەن هەرکەس لەئاستی خۆیەوە کە لەڕاستیدا ئەمە چارەسەری گونجاوە .

خوشكه بەڕێزەكانم ئەو سێ ڕێگەی سەرەوە لەبەردەمتانتدا هەركامیانتان پێخۆشه دەتوانن بیگرنه بەر بەلاَم گرتنەبەری هەركامیان وردبینی باشی پێویسته هەروا بەسەر پێی بڕیاری لەسەر نادرێت .جائەگەردەتوێت ژیانێكی خۆش بەسەرببەیت وبەدەوام بێت ئەوا ڕێگەی سێهەم هەڵبژێره وبڕیار بدە خۆت بگۆڕیت چاوڕێی بەرامبەر مەكە ، بەتایبەتی ئەودنیا پڕناسكیو جوانیەی كەخوای گەورە تۆی تیا دروستكردووە .هاوسەركانتان دەڵێن كێشەخێزانیەكان بەزۆری لەمانەی خوارەوە سەرهەڵدەدات :

١. دەستكورتی .!!
٢. خۆهەڵقورتاندنی خێزانم لەشتێكدا كەپەیوەندی بەوەوە نیه .
٣. بێ متمانەیی خێزانم و دوودڵی .
٤. بێ مەیلی خێزانم لەگەڵمدا خۆ نەڕازاندنەوەی لەگەڵ بارە ئاڵۆزەی بازاری تیایە .

٥. ئەگەر بڕیاربێت کارێك یان چوونەدەرەوەیەك ئەنجام بدەین بەڵام سەرنەگرێت خێزانم خۆی تووڕە دەکات .

٦. خێزانم زۆر لەشتێك دەڕوات کەئەوە ناهێنێت .

٧. دووبارە کردنەوەو بەڵکو سەدبارەکردنەوەی قسەیك یان هەڵسوکەوتێك کە منی تووڕەو بێزارکردووە .

## پرسیاری شەشەم:خۆشترین کات بەلاتەوە چ کاتیکە ؟

خوشکە بەڕێزەکەم ببینە وبزانە خۆشترین کات لای هاوسەرەکەت چ کاتێکە بۆ ئەوەی هەوڵبەیت لەوجۆرە کاتانە زۆر برەخسێنی بەتایبەتی ئەوەی پیوەندی بەتۆوە هەیە .

١. کاتێك دەڕۆمەوە منداڵەکان باوەشم بۆدەکەنەوە .
٢. ئەکاتەی هیچ کێشەیەکمان نیە .
٣. کە میوانەکانم بەڕێزەوە بەڕێدەکات .
٤. گەشت و سەیران کردن بە خێزانی .
٥. ئەوکاتانەی هاوسەرەکەم خۆیم بۆدەڕازێنێتەوە .
٦. ئەوکاتانەی کەهاوسەرم ڕووی خۆشەو منداڵەکان ئاسوودەن .
٧. کاتێك باوانی هەردوولامان بەخۆشی سەردانمان دەکەن .
٨. کاتێك بتوانم حەزەکانی هاوسەرم بەجێبهێنم .
٩. ئەوکاتانەی کەپەیوەندیم لەگەڵ پەروەردگاردا بەهێزە .

١٠. كە كەشوهەوايەكى ئارامم بۆدەرەخسێ بۆخويندنەوە .
١١. دانيشتن بە هێمنى و ڕازو نياز گۆڕينەوە لەگەڵ هاوسەرم .
١٢. ئەكاتانەى خۆشى وشاديەكانم نامرێنێت و هەست بەئازارەكانم دەكات .
١٣. نەبوونى كێشەى مادى و گيرفان پڕى .
١٤. ئەكاتانەى لەگەڵ هاوسەرم يەك بڕيارو هەڵوێستمان هەيە .
١٥. كاتێك هاوسەرم تەندروستى باشە.
١٦. كاتێك لەگەڵ هاوسەرم بەيەكەوە پەرستشەكان بەيەكەوە ئەنجام دەدەين .
١٧. كاتێك كەدەچمەوە ماڵەوە هاوسەرم بەگەرمى وڕووخۆشى پێشوازيم لێدەكات .
١٨. كاتێك دياريەك بۆهاوسەرم دەبەمەوە ودڵى پێى خۆشە .
١٩. كاتێك دەبينم هاوسەرم ئامۆژگارى منداڵەكان دەكات .

٢٠. كاتيك هاوسەرم خۆشەويستيم بۆ دەردەبڕێت دەڵێت خۆشم دەوێيت .

٢١. كاتێك هاوسەرم لەگەڵ دايك و باوكم گونجاوە .

## پرسیاری حەوتەم : پێشنیارت چیە بۆ هاوسەرت ؟

١. پاراستنی بنەماکانی هاوسەرێتی وەك خۆشەویستی و سەکینە .
٢. بە خەمۆکیو بێتاقەتی نەیبینم .
٣. هەمیشە ڕوخۆشو لێو بە خەندەبێت .
٤. زۆر خۆی بە ژیانی کەسانی ترەوە سەرقاڵ نەکات .
٥. زۆر قرەقرِ لەگەڵ منداڵ نەکردن .
٦. سنورێك بۆ توڕبوون دابنێت .
٧. بڕیاری کتوپڕ نەدات .
٨. گرنگی دان بە شتی معنوی ، پەیوەندی نێوان .
٩. مامەڵەی جوانو موسوڵمانانە لەگەڵ منداڵدا .
١٠. ثقە ی بە من ببێتو دان بە مافەکانمدا بنێت .
١١. گوێڕایەڵ بێت بۆ ئیسلام .
١٢. تفهمی کاری بانگەوازم بکات
١٣. ڕووی خۆش بێت لەگەڵ میوانو صلەی ڕەحم بپارێزێت .
١٤. لەیەك تێگەیشتنو لێبووردن .

١٥. قبوڵی نەصیحەت بکات .

١٦. تداخل لە ئیشی یەکتر نەکردن .

١٧. داخوازیەکانم جێبەجێ بکاتو پێزان بێت بە چاکەکانم .

١٨. راستگۆو حەق رەو بێت لە برپاردا .

١٩. قەناعەتی هەبێت تا خوا دەروی خێرمان لێدەکاتەوە .

٢٠. بزانێت مامەڵە لەگەڵ هەستو دەروونمدا بکات .

٢١. بایەخ بە خۆدانو حساب بۆ پەیوەندی سیکسی .

هیوادارین ژیانێکی خۆش وپڕلەخۆشەویستی بەسەرببەن وئاسوودەی هەردوو دنیا بن ....

## بەرهەمەکانی نووسەر :

- زنجیرەی ماڵێکی ئاسوودە:

١. چۆن هاوسەری ژیان هەڵدەبژێریت.؟

٢. ساڵی یەکەمی هاوسەرێتی.

٣. ڕازەکانی هەردوو هاوسەر بۆ یەکتر .

٤. چۆن دڵی مێردەکەت کەمەند کێش دەکەیت .؟

٥. چۆن دڵی خێزانەکەت کەمەند کێش دەکەیت .؟

٦. ئێستا تۆ باوکیت!

- قورئانی پیرۆز لە ١٠٠ فەرموودەی پێغەمبەردا.
- زنجیرەی ڕۆشنبیری یاسایی:

١. ڕێبەرێکی سەرەتایی بۆ ناساندنی یاساو سیستمی دادوەری لە کوردستان و عێراق.

- زنجیرەی بەرەو سەرکەوتن:

١. خوێندنەوە هەنگاوی یەکەمە بۆ سەرکەوتن.

٢. بنەماکانی سەرکەوتن.

٣. پاڵەوانێتی عەرەبی بۆ یادگە(ذاكرة) وەرگێڕان

- زنجیرەی شەهیدان و پێشینانی ڕێی بانگخوازی:

١. گوزەرێك بە نێو ژیاننامەی شەهید مامۆستا بەکر.

## پێناساندنێکی نووسەر



پارێزە ر/صالح سعید مصطفی

*لەساڵی١٩٦٥ لەگوندی چۆخماخ سەر بەقەزای ماوەت لەدایك بوە.

تەواوکردنی قۆناغەکانی خوێندنی (سەرەتایی ، ناوەندی و دواناوەندی ، زانکۆ ) لەشاری سلێمانی .

*ئاستی خوێندن؛ دەرچوی کۆلێژی یاسای زانکۆی سلێمانی،

*خاوەنی چەندین بابەتە لەرۆژنامەوگۆڤارەکان بەکوردی وعەرەبی.

*ئەندامی دەستەی دامەزرێنەری لقی موسڵی سەندیکای رۆژنامە نوسانی کوردستانە.

*ئەندامی فیدراسیۆنی جیهانی رۆزنامە نوسانە.

*ئەندامی کارایە لە سەندیکای رۆژنامەنوسان/لقی سلێمانی.

*ئامادەکارو پێشکەشکاری دووبەرنامەی تەلەفیزیۆنی لە کەناڵی سلێمانی و دوو بەرنامەی رادیۆیی لە دەنگی یەکگرتوو رادیۆی سلێمانی و موسڵ بووە.دەیان ئەڵقەی لێوە پێشکەش کردووە. ئامادەکارو پێشکەشکاری بەرنامەی ئاسوودەیی خێزان بووە لە رادیۆی میحراب. ئێستاش میوانی بەردەوامیی بەرنامەی بونیادە لە هەمان رادیۆ.

⋆لەماڵپەڕی((maktoob)) خاوەنی (پێگە)ی (نەوا)یە⋆کەبەزمانی عەرەبی بابەتی تیابلاّو دەکاتەوە .

- تا ئێستا خاوەنی چوار زنجیرە کتێبە کە (١٠) کتێبی لێ چاپکراوە لە بواری ڕۆشنبیری یاسایی و پەرەپێدانی مرۆیی و ڕاوێژکاری خێزانی. و قورئانناسی.
- خاوەنی لاپەڕە( پەیجی) ماڵێکی ئاسوودە لە فەیسبووك.
- بۆ داهاتوو بە پشتیوانی خوا چەند بەرهەمێکی تر دەخاتە ناو کتێبخانەی کوردی.
- خاوەنی ئیمتیاز و سەرنووسەری گۆڤاری کۆمەڵگە.
- کاری ئێستای فەرمانبەری یاسایی لە نووسینگەی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق لە شاری سلێمانی.

گرنگیدان به خێزان وەکو یەکەی سەرەکی پێکهێنەری کۆمەڵگە ، واتە گرنگیدان بە تەواوی کۆمەڵگە، وە چارەسەری کێشە خێزانیەکان واتە پاراستنی تەندروستی تەواوی کۆمەڵگە، بۆ گەیشتن بە هەموو جومگە گرنگەکانی خێزان پێویستە لە خودی هەردوو هاوسەر پرسیار بکەین، ئێمەش بۆ ئەوەی لە خێزانەکان دوور نەکەوینەوە بەڵکو چووینە ناو خودی خێزانەکان بە جیاوازی ئاستی ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتی و زانستی و فکری و جوگرافی، و پرسیارمان لە خودی هاوسەرەکان کردووە تاکو بگەینە وەڵامی ئەو پرسیار و داواکاریانەی لە ناخی هەردوو هاوسەردا هەیە بەرامبەر بەوی تر